لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
«دەستەی کورد»

# کچانی کورد

## گەشتێک لەناو ئافرەتانی موسوڵمان لە کوردستان

نووسینی :

**هێنی هەرۆلد هەنسن**

Henny Harald Hansen

دوکتۆر

**ناجی عەبباس ئەحمەد**

لە ئینگلیزییەوە وەری گێڕاوەتە سەر کوردی

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق

بەغدا — ١٩٨٠

لە چاپکراوەکانی کۆڕی زانیاری عێراق
«دەستەی کورد»

# کچانی کورد

گەشتێك لەناو ئافرەتانی موسوڵمان لە کوردستان

نووسینی :
# هێنی هەرۆڵد هەنسن
**Henny Harold Hansen**

دوکتۆر
# ناجی عەبباس ئەحمەد
لە ئینگلیزی‌یەوە وەری‌گێڕاوەتە سەر کوردی

چاپخانەی کۆڕی زانیاری عێراق
بەغدا — ١٩٨٠

# پێشەکی

ئەم کتێبەم لە ئینگلیزییەوە ـ بە دەقی خۆی وەرگێڕایە سەر کوردی • نووسەر بە دۆستانە باسی ئافرەتانی کوردی کردوە • لە هەندێ جێگا هەڵەی کردبێ و من فەرقم پێ کردبێ لە پەراوێزدا چاکم کردوە • لەوانەشە لەبابەت ئافرەتانەوە هەڵەی‌تری کردبێ و من پێم نەزانیبێ • لەبەرئەوە لە ئافرەتە خوێنەرەکان تکا دەکەم چیان بە هەڵە و چەوت زانی بۆم بنووسن تاکو لە چاپی دووەم لەپەراوێزدا چاکی بکەم •

من کە ماوەیێك لە سولەیمانی ژیام و لەگەڵ هەندێ ئافرەت قسەم کرد و لە بابەت ژیان و ماڵ و منداڵیانەوە شتم زانی و بەراوردی ئافرەتی کوردم کرد لەگەڵ ئافرەتانی ولاتانی‌تر ، ئەم پێشنیارانەی خوارەوە دەکەم :

١ـ مووچەخۆری شتێکی تازەیە لەناو ئافرەتانی کورد ، لەبەرئەوە زۆر حەزی لێ دەکەن • بەڵام ئەم حەزلێ‌کردنە نابێ لەسەر حیسابی کۆرپە شیرینەکانیان بێ • بەخێوکردنی منداڵ ـ دەبێ بزانن ـ بەرزترین و نایابترین پیشەیە • بواردن (واتا اهمال)ی منداڵ لەبەر هەرچی بۆنەیێك بێ ، تاوانێکی گەورەیە • ئەو منداڵە کە گەورە بوو رقن ، ترسنۆك ، تووڕە ، نەخۆش یان لە کار و کردەوەی تەوەزەل و کەمتەرخەم دەبێ •

٢ـ نابێ منداڵ نازدار بکرێ و هەرچی ویست بیکا ، تەنانەت جنێو بە باوك یان دایکی بدا • ئەم بابەتە رەوشتە خراپە تەنیا لە سولەیمانی و

دەورووپشتی هەیە • لە لادێیەکانی تری کوردستاندا وەکوو بزانم نیە • منداڵ دەبێ باش و هەندێ جار بە توندی بەخێو بکرێ تاکو کە گەورە بوو ببێتە ئەندامێکی باشی کۆمەڵ و لەگەڵ خەڵکا رێککەوێ • هیوام وایە خوێنەرەکان منداڵی نازداریان نەبێ ، ئەو منداڵانە کە گەورەبوون لەگەڵ خەڵکا رێکناکەون و تووشی زۆر ناخۆشی دەبن •

٣ــ دەبێ ئافرەت ماڵەکەی پاك و خاوێن ڕابگرێ • کە لەگەڵ چەند ئافرەتێکا یەکیان گرت و چوونە مێوانی ، نابێ ماڵی خانەخوێکە بە قرتاندنی تۆو بکەنە زبڵخانە • نازانم کەی ئافرەتان واز لە رەوشتی ناشیرینی تۆو قرتاندن دێنن کە هیچ سوودی نیە و زیانی هەیە •

ئەمە چەند پێشنیارێکی بچووکە بۆ ئافرەتەکان دەیکەم ، ئەو ئافرەتانە کە ــ خانمە نووسەرە دێنمارکیەکە دانی پیا دەنێ ــ بە قیمەت ، باش و بۆ ماڵ و کەس‌وکاریان دڵسۆزن و ، هەموو دەمێ رەنج دەدەن بۆ بۆ حەسانەوەی مێرد و منداڵیان •

**وەرگێر**



نووسەری ئـەم کتێبە
بە بەرگی کوردیەوە

# سەرەتــای نووسەر

لە پاش تەواوکردنی دەسنووسی ئەم گەشتنامەیە پێیان گوتم دەبێ لەپێش هەموو شتێکا خوێنەر تێبگەیێنم کێ رۆیشتوە بۆ کوێ و بۆچی ؟

لە سەرەتای سالی ١٩٥٧ حکومــەتی عــێراق بڕیــاری دا لەپێــش تەواوبوونی بەستێنی (واتا سەددەی) دووکان لەسەر زێی‌بچووك کە دەبێتە هۆی ژێرئاوکەوتنی هەرێمێك ، دەبێ ئەو هەرێمە لە لایەن لیژنەیێك لــە پسپۆڕانی کۆنەناس بکۆلرێتەوە بۆئەوە کە هەرچی کۆنینە (واتا آثــار قدیمە ) هەیە لە فەوتان و لەناوچوون لە ژێر بنەوانەکە بپارێزرێ • ئەم کارەش بە لیژنەیێکی دێنمارکی سپێردرا • ئەم لیژنەیە قسەی کرد لەگەڵ بەشــی خەلك نــاسی Ethnographical Department ی مۆزەخانــەی میللی دێنمارك بۆ ئەوە کە خەلك ناسێك Ethnologist بدۆزرێتەوەو بخرێتە پاڵ لیژنەکە بۆئەوە کە لە گوندەکانی هەرێمی بناوانەکە نــەختێ توێژینەوەی (لێکۆلینەوەی) خەلك‌ناسی بکرێ • مۆزەخانە منی دۆزیەوە بۆئەوە کە لەو هەرێمە ــ بێجگە لە لێکۆلینەوەی خەلك‌ناسی ــ بتوانم ــ من کە ئافرەتم ــ بە ئاسانی بچمە ناو ئافرەتانی کورد • ئەم تواناییەی مــن هەموو پیاوێك ناتوانێ بیکا ، چونکە پیاو بۆ ئەوە کە لەبــابەت ئــافرەتی موسولمانەوە شت کۆکاتەوە زۆر بە ناخۆشی دەتوانێ بچێتە ناویان •

کۆمــەلی Carlberg بۆ لێکۆلینەوەی زانستی لەم بابــەتەوە پارەیێکی باشی دامێ • لە ٤ی مایسی ١٩٥٧ دێنمارکم بەجێ‌هێشت و بــە

ڕێگای بەغداو کەرکووکدا گەیشتمە ناو لیژنەکە لە سەر بەستێنی ( واتــا سەددەی) دووکان • ئەم بەستێنە کە لە کوردستانە لە باکووری عیراق و دەکەوێتە خالیك لە سەر نەخشە کە هێڵە درێژی ٤٥° دەگاتە هێڵەپانی ٣٦°ی بـــا کوور •

لەپێشدا وام بڕیار دابو لەگەڵ ئەندامەکانی‌تری لیژنەکە نزیك گردی شەمشارە دابەزم و بۆ دێیەکانی دەور و پشت بچم و لە هـــەر دێیــێــك ماوەییێك رابوێرم • بەڵام لەپاشدا وام بە باش زانی بچمە دێی تۆپزاوە ــ کە نزیك بەستێنەکەیە و لەوێوە کرێکار دەهاتن بۆ ئیش‌کردن • لەسەر پرۆژەکە ( واتا مەشرووعەکە ) ــ و لەوێ بە مێوانی شێخی دێیەکە بمێنمەوە و بــە رەحەتی و ئاسانی خەریکی تۆژینەوەکەم بم •

بۆ کارەکەم پیویستم بە وەرگێڕێکی (واتا تەرجومانێکی) ئــافرەت بوو • بە هۆی مامۆستا توفیق وەهبی و پارێزگەری سولەیمانی لە پــاش دوو حەفتە توانیم مامۆستاییێکی کوردی گەنج بدۆزمەوە و رازی بــوو ببێتە تەرجومانم • لە پاشان ماوەییێکی درێژ لەگەڵ بنەماڵەکەی لە سولەیمانی مامەوە و لەگەڵی توانیم بچمە چەند دێییێك و سەر لە زۆر ماڵ بدەم کــە پەیوەندی‌یان لەگەڵ بنەماڵەکەی هەبوو • بەم چەشنە لە باتی ئەوە لــەگەڵ هاوولاتیەکانم بژیم و رۆژی چەند سەعاتێ بچمە ناو خەڵــکی ولاتــەکە ، هەموو ماوەکەم لە ناو کوردەکان ڕابوارد و بەم جۆرە توانیم باشتر شارەزای باری ژیار ( واتا حضارە )یان بم •

هەر دوو حەفتە جارێ کە ئۆتۆمۆبیلی لیژنە لە گردی شەمشـــارەوە دەچوە شوێنی بەستێنی دووکان بۆ هێنانی شتی پێویست منیش لــەگەڵی دەچووم • بەمە پەیوەندیم لەگەڵ لیژنەکە و ئەندامەکانی نەبڕرا • وە بــۆ ناردنی ئەو شتانە کە کۆم کردبوەوە بۆ مۆزەخانەی میللی لە **Copenhagen**

جار جار دەچوومە بەغدا • بێجگە لەم سەفەرە کورتانە من هەموو دەمێ بە کۆمەکی تەرجومانەکەم خەریکی کاری خۆم بووم •

بێجگە لە تۆپزاوە و رەقاوەی تەنشتی و سولەیمانی هەندێ جار دەچووینە میرزا رۆستەم لە سەر زێی بچووك لە بەینی دووکان و شەمشارە• بە ئۆتۆمۆبیل سەرمان لە شەدەلە دا و لەوێوە بە سواری بەسەر شاخی چەرمەبانا گەیشتینە سەرگەلوو • جارێکیان چووینە هەڵەبجە ، بەڵخە و تەوێڵە لە ناو شاخەکان لەسەر سنووری ئێران و چووینە دێی (سەرکان)ی نزیك پینجوین و لەوێ ماینەوە • لە پاشا بۆئەوە کە ئاگام لە جێگاکانی تری کوردستانی عیراق بێ بەسەر کەرکووك و هەولێرا گەیشتینە مووسڵ ، وە لە هەولێرەوە بەرەو رۆژهەڵات پێشکەوتین هەتا ڕەواندز • لە دوارۆژەکانی مانم لە بەغدا پێش گەڕانەوەم توانیم سەر لە حیللە و بابل لە خواری بەغدا بدەم •

با چەند قسەیێك بکەم لە بابەت جوغرافیە و مێژووی هەرێمی کوردستانی عیراق • کوردەکان مێژووی باوانی خۆیان دەگەیێننە کاتێکی زۆر کۆن و دەڵێن لە سەدەکانی کۆنەوە لە نیشتمانی ئێستایان ژیاون • لە سالی ٤٠٠ پێش زایین Xnophon لەگەڵ ١٠٫٠٠٠ یۆنانی کە لە ئێران گەڕایەوە لە شاخەکانی لای زاخۆ ، ئەو شاخە کە ئێستاش کوردی لێ دەژی ، شەڕی لەگەڵ نەتەوەی کەردۆخی کرد •

لە پاشا کوردەکان کەوتنە ژێر حوکمی عەجەم ، عەرەب و تورکی عوسمانی • ئێستا کوردەکان لە عیراق و تورکیە و ئێران و سووریە و یەکیەتی سۆڤیەت دەژین • کوردەکان موسولمانن و زمانەکەیان هیندو ئەورووپاییە و لە فارسیەوە نزیکە • هەندێ لە کوردەکان رەوەندن ( کۆچەرن ) و گەرمیان و کوێستان دەکەن • وە بۆ سێ مانگ هاوینان

دەچنە کوێستانەکانی نزیك سنووری ئێران بۆ لەوەڕاندنی مەڕ و ماڵاتیان بەڵام زۆربەی کورد دامەزراون و نیشتـــەجێن و خەریکی وەرزێری ( واتا کشتوکاڵ)ن • برنج ، لۆکە ، تووتن ، کونجی و داری بەردار دەچێنن • کوردەکانی ناو شارەکان کە لە ماڵیان مامەوە خەریکی ئیـــش ، کاسبی و بازرگانین •

بەرهەمی زانستی تۆژینەوەکەم لەپاشان دەنووسرێ و بڵاودەکرێتەوە• ئەمە گەشتنامەیە • لێرە وەکوو ئافرەتێك لە ناو ئافرەتانی موسولمان تەنیـــا باسی رابواردنی خۆم دەکەم •



– ١ –

# ساڵێکی بێ هـاوین

سەرەتای مانگی مایس ، کە دێنمارکم بەجێ‌هێشت ، بەهارێکی کورت بوو و دارەکان گەڵای سەوزیان لێ روابوو • بـەڵام کە لە ناوەڕاستی ئەیلوول لە عیراق گەرامەوە بۆنی پایز دەهات و هەنـدێ کەس جەژنـە پیرۆزەی ساڵانەی کرسمس Christmas یـان دەکرد کـە بـۆ گرینلەندی (١) بنێرن •

واتا ئەمساڵ هاوینم نەبوو • هاوینە خۆشەکانی جارانی دێنمـارکم دەهاتەوە بیر و زۆر بیریم دەکرد • ئەو مانگە گەرمانە کە لە عـیراق ــ ٢٠ پایەی هیلی پان لە باشوور ــ ڕام‌بوارد شتێکی‌تر بو لە هاوینی ئێمـەی نەدەکرد • هاوین لە ئاوو هەوای ئێمە وەرزێکی (واتا مەوسمێـکی) زۆر خۆشە • هەموو ساڵێ زستانان هیوای هـاتنی دەکەین ، خـەوی پێـوە دەبینین و کامەرانی و خۆشترین رۆژانی ژیان دەهێنێ •

---

(١) ئەم جەژنەیە ، جەژنی لەدایک‌بوونی حەزرەتی عیسایە لە ٢٤ی کانوونی یەکەم • گرینلەند دوورگەیێکی زۆر گەورەیە لە رۆژهـەڵاتی بـاکووری ئەمەریکا کە ...ر.٥٠ کەسی تێدایە و لە ژێردەستی وڵاتی دێنمارکە •

وەرگـێڕ

یەکەم جار کە زانیم لە (دووکان) نیوەڕۆ لەبەر گڕەی گەرما دەبێ ئیش ڕاوەستێ چونکە ڕەنجبەرەکان ناتوانن دەس لە پارچە ئاسنەکان بدەن کە داغ دەبن نەك دەسیان بسووتێ ، سەرم سوڕما و بڕوام نەکرد ، چونکە تۆ دەبێ خۆت زۆر گەرمی و گڕە و هەڵاوی باش بچێژی هەتا بڕوای پێ بکەی •

لەپاشا ڕۆژێك پاش نیوەڕۆ بە ئۆتۆمۆبیل لە دەشتی قرفە تێپەڕ دەبووین کە دەکەوێتە بەینی خالص و چیای حیمرین • ئەم دەشتە سەحرا نیە بەڵکو دەشتێکی ستێپی Steppe ی کەم ڕووەکە کە تەنیا بەهاران هەندێ گیا و بنچکی لێ دەڕوێ • پەستۆی نزم (واتا ضغطی نزم) ستوونێك تەپوتۆزی لە زەویەوە بۆ عاسمان بەرزکردبوەوە و ئەم ستوونە تۆزە گەرمە ناخۆشە بەناو دەشتەکەیا خولی دەخوارد و دەگەڕا • بێتو بکەویە ناو ئەم جۆرە ستوونە ، تۆزەکە دەچێتە ناو چاوت ، گوێت و دەم و لووتت• ئێمە هەر ئەوەندەمان پێ‌کرا پەنجەرەکان داخەین و ڕاست بە ناو ستوونی تۆزەکەدا و لەشوێنی ئۆتۆمۆبیلەکانی تری پێش‌کەوین •

زۆر بێ ئەقڵی بوو لەم دەشتە بیابانە گەرمە بە ڕۆژ تێپەڕین • چەند جارێکی تری کە لە کەرکووکەوە بۆ بەغدا دەچووین تەنیا شەوان بە فێنکی دەکەوتینە ڕێ و تێپەڕ دەبووین • لە ڕێگا چەند چایخانەیێك هەبوون لە قوڕ و خشتی کاڵ دروست کرابوون کە لە دەرەوە لە دەشتەکە باش فەرق نەدەکران • لەو چایخانانە سێبەر و ئاو هەبوو • ئاوەکە شیرتێن بوو ، وە لەپاش کوڵاندن ــ کە پاکتر دەبوو ــ چایی پێ دەکرا • لە ئۆتۆمۆبیلەکە بێجگە لە مەلیحە و براکەی پیرێژنێك هەبوو • ئەویش کرێی خۆی دابو و سەفەری دەکرد • لە چایخانەکە ژنەکە چوە لای مەرکانەی ئاوەکە کە هەندی سەهۆڵی تێدا بوو و بە دەستی پارچە سەهۆڵێکی دەرکرد و پێچایەوە و خستیە بەرسنگی • کە گەیشتینە چایخانەیێکی‌تری ژنەکە پارچە سەهۆڵەکەی

دەردەهێنا و دەیخستە ناو کاسەیێك ئاو و بۆ ساردکردنی بە پەنجەی ـ کە زۆر پاك نەبوو ـ تێکی دەدا • لە پاشا ئەم کاسە ئاوە ساردەی بە خۆشیەوە پێشکەش دەکرد •

من بڕوام بەوە نەدەکرد لەکاتی گەرما وا ئەوەندە زۆر ئاو و شلەمەنی بخۆمەوە • تۆ هەر خەریکی خواردنەوە بووی : ئاو ، چای ، ماستاو و هەرچی شتێکی‌تری کە بخورێتەوە • لەش لە سەر ئارەقەکردن دەوامی دەکرد و لاواز و بێ تاقەت دەبوو •

**سەرتوێژی ( واتا قەیماغی ) حیللە :**

جارێکیان لەگەڵ دۆستە کوردەکانم لە حیللەوە دەگەڕاینەوە بۆ بەغدا • ویستمان پێش رۆژهەڵات بکەوینە ڕێ ، لەبەرئەوە لە شاری حیللە نان و چای و شووتی‌مان خوارد • زۆر بە ناو شارەکەدا بە ئۆتۆمۆبیلەکەمان گەڕاین بۆ ئەوەکە ژنێکی لادێیی وا بدۆزینەوە سەر توێژەکەی پاکتر بێ • سەرتوێژەکان هەموو سپی بوون لە مەڵهەمیان دەکرد و لە شیری مانگا و بزن دروستکرابوون [1] • لە دواییدا سەرتوێژمان لای ژنێك دۆزیەوە کە لە سەر زەوی دانیشتبوو و سەرتوێژەکەی کردبوە ناو چەند قاپێکی بچووك • قاپێ سەرتوێژمان کڕی• من نەمتوانی مەڵهەمەکە تام کەم چونکە زۆر مێشی لەسەر نیشتبوو ، بەڵام قاپەکەم هەڵگرت و ئێستاش لامە • بڕوا ناکەی پێت بڵێم هێشتا بۆنی بزنی لێ دێ •

لە حیللە لە چایخانەیێك دانیشتین لە سەر مەیدانێکی گەورە و تەماشای دەور و پشتمان دەکرد • هێشتا بەیانی زوو بوو • دەمانویست لەگەڵ

---

(۱) سەرتوێژ لەو ناوە لە شیری مانگا و گامێش دروست دەکرێ .
**وەرگێر**

تەرجومانەکەم و براکەی بچین بۆ بابل • تەرجومانـەکەم کە ئافرەتێـکی موسولمان بوو نەیدەتوانی بە تەنیا بگەڕێ • لەبەر ئەوە هەمیشە براکەی لەگەڵ بوو • من ئیشەکەم لەناو ئافرەتانی کورد تەواو بووبوو ، تەنیـا بۆ دیتنی کۆنینە (آثار)ی بابل بۆ ئەوێ هاتبووم • لە بابل چاومان بە دەرگای عیشتار ، شێرە بەردینە و مۆزەخانە کەوت • کوڕێکی بچووکی ۱۲ سالـە ـ کە کراسێکی درێژی لە بەر بوو ـ رابەرمان بوو • بە ئینگلیزی‌یێکی باش باسی کۆنینەکانی بۆ دەکردین • لە مۆزەخانەکە وێنەی دروست‌کراوی قەڵا و ئەهرام هەبوون • ئێمە کەوتینە ڕێ بۆ گەڕانەوە بۆ بەغدا •

**گەڕانـەوە بۆ بەغـدا :**

بەڵام کات درەنگ بوو و دنیا گەرم بووبوو • دیمەنی ئەم ناوانە لەو دیمەنە جوانانەی ناو شـاخەکانی کوردستانی هـاوڕێکانم جیاواز بوو کە ماوەیێکی درێژ تێدا ژیام •

لە ناوەڕاستی ڕێگا لە بەینی بەغدا و وێرانەکانی بابل بەنزینمان لێبڕا و راوەستاین • بەڵام ئێمە خواوراستان لە سەر رێگای دەشتی قرفە نەبووین کە پەکمان کەوێ ، بەڵکو لە سەر ڕێـگای حیللە و بەغـدا بووین کە زۆر ئۆتۆمۆبیلی پیا دەڕوا ، یەکێ لە ئۆتۆمۆبیلەکان کە لەوێوە تێدەپەڕی هەر رادەوەستێ و بەنزینمان پێدەدا •

لە کاتی راوەستان بوە نیوەڕۆ و گەرماکە ئەوەندە تیژ بوو مرۆڤ زۆر بە ناخۆشی بەرگەی دەگرت • لە کاتی ڕۆیشتنی ئۆتۆمۆبیل بایە گەرمەکە دەسووڕێتەوە و لە پەنجەرەکانەوە تێپەڕ دەبێ • بەڵام کە لە سەر ڕێـگا رادەوەستام هەستم بە گەرمایی‌یێکی تیژ دەکرد •

ئەوەندەی نەخایاند پاسێکی پڕ لە ڕێبوار کە لە کەربەلاوە هاتبـوو راوەستا و بەنزینی پێداین • کەربەلا شارێکی پیرۆزە لە ناوچەی فورات ، گۆڕی حەزرەتی حوسەینی لێیە و موسولمانەکان زیارەتی دەکەن •

**گەرمـای هـاوین :**

ناخۆشی گەرما و گڕ و هەڵاوی هاوینی عیراق شتێکە دەبێ لە بیرمان بێ و خۆمانی لێ بپارێزین ، چۆن لای خۆمان لە دێنمارك لە سەرما و سۆڵەی زستانی سەخت دەبێ خۆمان بپارێزین نەك لە سەرمادا بچین و بمرین •

هەندێ جار پایەی گەرمی دەگاتە ١٢٠°ف [١] • مرۆڤ کە تووشی دەبێ وا گومان دەکا دەتوانێ بە دەس بیگرێ • کە بەنـاویدا دەڕوا وا دەزانێ بەناو گڕی ئاگردا تێپەڕ دەبێ • بەڵام لەم گڕی ئاگرە تۆ کەمـتر بەترسی •

ئەو ئینگلیزە کە لەسەر شوێنی بەستێنی دووکان ناسیم پێی گوتـم هاوینی یەکەم هەستی ئەوەی دەکرد خەریکی شـەڕە لەگەڵ ناڕەحـەتی ، بەڵام هاوینی دووەم بە زۆر پێی دەکرا بەرگەی گەرما بگرێ •

ئەو خۆراکی کوردەوارییە کە پێی دەژیام وابزانم کۆمەکی کردم بـە باشی بەرگەی گەرما بگرم • کەرەستە گرنگەکان برنج و نان بوو • گۆشت کەم بوو ، سەوزە زۆر بوو ، میوە زۆرتر • من هەموو ئەو شتانەم کرد کە تەمێ کرابووم نەیـکەم • نیوەڕووان دەچوومـە دەرەوە ، بـەڵام یـان سەرکڵاوێکی ئەستوورم دەخستە سەر ، یان سەرم باش دەپێچا • لە بـاتی لۆکە نایلۆنم لەبەر دەکرد و زۆر باش بووم •

خانوە ئینگلیزیەکانی لای بەستێنی دووکان زۆر قایم بوون ، لـە بەرد باش دروست کرابوون • دیواری ئەستووریان هەبـوو • هەمـوو پەنجەرەکان دەرگای داریان پێوە بوو دژی هەڵاو و گڕی گەرما • لە نـاو ژوورەکان پانکە و مەکینەی هەوا ساردکەرەوە هەبوو کە پلەی گەرمـی

---

(١) ١٢٠°ف = ٤٩°س . لە بەغدا بە دەگمەن پلەی گەرمی دەگاتە ٤٩°س ئەویش لە مانگی ئاب و تەمووز روودەدا .

وەرگـێڕ

دەهێنایە خوارەوە و وەك هی ئەورووپای لێ دەهــات • کە لــەم ژوورە خۆش و فێنکانەوە دەهاتیە دەرەوە هەستی ئەوەت دەکرد گەرماکە بە تینترە• تو ئەوەندەت نەدەما لە گەرمانا لە هــۆش خــۆت بچی • بــەڵام ژووری کوردەکان لە دێیەکە وا نەبوو لایێکی کرابوەوە ، لەبەر ئەوە بە سیبەر بوو و نەختێ فێنك بوو • کە لە ژوور دەچوویتە دەرەوە هەستی گەرما و گــڕی زۆر خراپ نەبوو •

ئەوەی شایانی باسە من حەزم دەکرد ئارەق بکەم ، ئەوەندەی پــێ نەدەچوو وشك دەبوومەوە • ئارەق کردن بەڕاستی خوش بۆ •

گەرمترین ڕۆژم لە کوردستان رۆژێکی یەکشەمە بوو پاش نیوەڕۆ لە لای بەستێنی دووکان • گردەکەی بەرامبەرم زۆر سپی دیار بوو • لەسەر ڕێگاکە بووم کە هەتا خانووی مێوانان Resthouse بە بەرد تەخت کرابوو • لە تەنشت لۆرییێك چەند دەقیقەیێك قسەم کرد • گەرما کە ئەوەندە بە تین بوو هەستی ئەوەم دەکرد دەتوێمەوە و دەبمە هەڵم • شەوەکان باش بوون ، هەتاو نەدەما ، گەرما دەما ، بەڵام بە تینێکی کەمتر •

لە یەکێ لەم شەوانە لەسەر بانی پێش ئەو خانوە کە مانگێ پتر تێیدا ژیام لە دێی تۆبزاوە هەڵپەڕکێ بەسترا • تەنیا پیاوەکان هەڵدەپەڕین [1] • ئێمە ئافرەتان لەسەر بانە قوڕەکە پێکەوە بۆ خۆمان دانیشتبووین قسەمــان دەکرد و چایمان دەخواردەوە•هەموو قاپ و شتومەکی چای‌کردن هێنرابوونە سەربان : سەماوەر هەبوو بۆ کوڵاندنی ئاو بە هۆی ئاگری خــەڵووز کــە لەناویەتی ، قۆری چای ، قاپی شەکر ، پیاڵە و ئیستیکان ، تاسێك ئــاوی سارد بۆ شۆرینی پیاڵە و ئیستیکانەکان بۆ ئەوە کە دوبارە پڕ بکرێن • ئەم

---

(١) لە زۆر دیهاتی کوردستان رەشبەڵەك هەیە واتــا پیــاو و ژن پێــکەوە هەڵدەپەڕن .

**وەرگــێڕ**

هەموو شتومەکە لە سەربان لە تەنشت سینیێکی گەورە دانرابوون و لە پشتیەوە کچێکی حەودە ساڵانیماڵەکە لەسەر پارچە فەرشێك بە چوار مەشقی جوان و قنج دانیشتبوو • لەم شەوە گەرمە ئیستیکانەکان پڕدەکران و دەخورانەوە • تەپڵ و بلوور بە ئاوازێکی یەك دەنگ و یەك نەسەق دەوامی دەکرد • هەرچی چرای نەوت لە دێیەکە هەبوو هەموویان هێنابوە سەربانی هەڵپەرکێ • چاومان لە جوولانەوە و هەڵپەڕینی پیاوەکان بوو شان بە شان وەك شەپۆلی ئاو بەرزدەبوو و نزم دەبوەوە • دێیەکە لە تاریکی نوقووم بووبوو • لە عاسمان حەوتەوانە دەدرەوشایەوە • حەوتەوانە وەکو لە ناوەکەی دیارە حەوت هەستێرەیە • ئەمە یەکێ لە وشە کوردییەکانە کە لە سەرەتادا فێری بووم •

بەڵی ئیمساڵ هاوینم نەبوو • ئەوەی کە بینیم و تێدا ژیام ئەو هاوینە نیە کە ئێمە لە دێنمارك تێی دەگەین • لە پاشان لەگەڵ ئەم جۆرە هاوینە دەبێ تۆ ئاگات لە خۆت بێ • چونکە ئەمە هاوینێکی سەیر و خراپە • نابێ تۆ لەگەڵ ئاگر یاری بکەی •



وێنەی خـانووی شێخ لە تۆپزاوە

– ٢ –

# ئەوا بووکەکە هـات

لەکاتی مانەوەم لە کوردستان توانیم سێ شایی ببینم • بەڕاستی تەنیا بە نیوەچڵی چوومە شایی یەکەم ، چونـکە ئەو دەمـە هێشتـا لـە نـاو ئەندازیارەکانی ئینگلیز دەژیام لە دووکان • کۆمەڵـەی ئەندازیـارەکانی ئینگلیز و فرانسز لە ناوەڕاستی کوردستان لە دووکان پێکەوە وەکوو لـە دێیێکی ئەورووپا بن دەژیان • شاخ لە هەموو لایێ دیار بوو • لەسـەر سەکۆ پانەکانی ئەم شاخانە دیهاتی بچووک بچووک هەبوون کە دانیشتوەکانی لە خانووی قوڕا دەژیان کە سەربانەکانی تەخت بوو • دێهـاتی کورد وەك چاوێك وان نیوەی کرابێتەوە • تەماشای دەکرد و نیوەی قووچابێ • ئەم دێهاتە تەنیا لە لاییکەوە دەبینرا • لە لایەکانیتریەوە تێکەڵی ئەو رووزەمینە Landsepe دەبوو کە خانوەکان لە گڵەکەی دروست کرابوون•

که به پاس تێدەپەڕیم لەڕێگا دێیێك خۆی پیشان دەدا و دەردەکەوت لە جێگایێك که پێش دەقیقەیێك تەنیا گرد و زوورك و هەڵەت هەبوون •

له دووکان من سەرسام دەبووم چۆن ئینگلیزەکان توانیویانه دەورەی خۆیان تەواو وەك نیشتمانەکەیان لێ بکەن : باغاتی گوڵ ، زەوی تەنس ، خۆراکی ئینگلیز ، رابواردنی ناو نادی ، بەرگی پاکی ئوتوودراو و ویسکی تەزبو ... هتد • ئەمانه هەموو وەك شوورەیێکی بەرز جیای دەکردنەوه له کوردستانی دەور و پشتیان • له دووکان شەو هەتا بەیانی ئەلەتریك دەسووتا • شەو هەتا بەیانی دەنگی حەسحەسی چەکدار دەهات که بەناو ڕێگا زیخاوییەکاندا هاتوچۆیان دەکرد • که ئیش دەستی پێ کرد سێ ساڵ لەمەوپێش گوایا هەندێ کەس له گوندەکانەوه تەقەیان له ئەندازیارەکان کردبوو •

**کرێکارە کوردەکان :**

له دێهاتی دەور و پشتی دووکان کرێکار دەدۆزرایەوه بۆ ئەوه که له پرۆژەی دروستکردنی بەستێنەکه ئیش بکەن • ئەمه پرۆژەیێکی زۆر زەلام و گەورەیه بۆ ئەوه که بناوانێك له پشت بەستێنەکه بێته کایه که خوا دەبوایێ بیکردایێ • بۆ باغچەی گوڵ و کاری ناوماڵیش رەنجبەری ئێرینه به کرێ دەگیران •

لەبەر ئەوه که ئافرەتانی کورد وەکوو هەموو ئافرەتێکی موسوڵمان حەز ناکەن بۆ ئەورووپایی ئیش بکەن ، ئەمان دەربەست بوون بۆ سەرپەرشتی باغچەکه و ئیشی ناوماڵ ئێرینه به کرێ بگرن • ئەو پیاوانه که له دروستکردنی بەستێنەکه کاریان دەکرد بەرگی رەنجبەری ئەورووپایان دەپۆشی • لەپاشان که له دووکان دوورکەوتمەوه و چوومه تۆپزاوه ، هەندێ جار بۆ سەردان که دەهاتمه دووکان گەنجێکی لادێیی جوانکەلە

که له تۆپزاوه به بەرگی کوردەواری دیبووم ، لەوێ به بەرگی چاکەت و پانتۆڵی چلکنی فیتەرچی‌یێك به زۆر دەمناسییەوە • ئەو فیتەرچیە که کوڕی شێخ بوو له ماڵەوه به مرۆڤێکی پیرۆز تەماشا دەکرا و به ئەندامی بنەماڵەیێك دەژمێررا که پشتاو پشت حوکمی دەکرد • بەلام له دووکان رەنجبەرێك بوو رۆژاورۆژ وەستایی خۆی دەفرۆشت • ئەوی بایەخی دەدایێ له ناو کوردان شەرواڵ و مرادخانیەکەی نەبوو ، بەڵکو بنەماڵەکەی بو • یەکێ له بنەماڵەیێکی ناسراو و نەوەی چەند کەسێکی ناسراو و دایکی له بنەماڵەیێکی بەناوبانگ بێ ئیتر عالەم رێز و حورمەتی لێ دەگرێ • کە یەکێك له بنەماڵەیێکی بەناوبانگ بێ له میوانداری ، باش ژیانی ناوماڵ ••• ئەو کەسە له ناو کوردەکان به باش و بەرز ناو دەردەکا • ناوبانگی باش و پەیوەندییەکانی بنەماڵە واتا خزمایەتی ، ئەمانە شتی به نرخ بوون لەو دێیە که تێدا دەژیام ، ئەمانە پارەیێکن لەوێ دەچێ •

**شایی و هێنانی بووك**

چەند رۆژێ پێش ئەوه له گوندەکه بژیم چوومە شایی‌یێك • من چەند جارێ سەرمدابو لەو ماڵە کوردە که بڕیارمدا لەگەڵ ئافرەتەکانی بژیم و چەند جارێ لەوێ نانم خواردبوو • لەبەر زانینی کەمم که به کوردی قسە بکەم داخەکەم نەمتوانی به خۆشی و باشی سوپاسیان بکەم • کوڕی ماڵەکە ــ که تۆزێ ئینگلیزی دەزانی ــ پێی‌گوتم شایی‌یێك دەبێ و بووکەکە له گوندێکی‌ترەوە ــ که نەختێ دوورە ــ دەهێنرێ • کۆمەڵێك ئۆتۆمۆبیل خزم و کەسوکار دەبەن بۆ هێنانی بووکەکە و بەڵێنی دامێ لە یەکێ لە ئۆتۆمۆبیلەکان جێگام بۆ دانێ •

لەگەڵ ئەوەشدا له عیراق رێگای ئۆتۆمۆبیل کەمه ، ئۆتۆمۆبیل زۆرە• هەرچاوم به ئۆتۆمۆبیل دەکەوت پڕ بوو له پیاوی سەر به مشکی و ئافرەتی

عەبادار • بۆ هێنانی بووکەکە چەند ئۆتۆمۆبیلێکیان تاقی‌کردەوە کە بتوانێ بە هەورازەکەی دێیەکەدا سەرکەوێ، بەلاّم بێجگە لە لەندرۆڤەر هیچیان نەیتوانی بە باشی و رەحەتی سەرکەوێ •

داخەکەم من نەمتوانی لەگەڵ خەلْك بۆهێنانی بووکەکە بچم • چونکە من لە خوارەوە لە دووکان چاوەڕیم دەکرد • بەلاّم کە ئۆتۆمۆبیلەکان سەعات شەشی بەیانی لەوێوە تێپەڕین هەموو پڕ بوون ، تەنانەت هەندێ کەس لە سەربانی ئۆتۆمۆبیلەکان دانیشتبوون • لەپاشا زانیم کوڕی مالەکە نەدەبوایێ بەڵێنی‌وای بە من بدایێ ، چونکە من ئافرەت بووم و دەستووری ئێرە ئەوەیە تەنیا پیاوان بۆ هانینی بووك بۆ مالی باوکی دەچن •

لەناو ئەو خەلکە کە بۆ هێنانی بووکەکە چوون لە هەمووی سەیرتر کوڕە شێتەکەی ئاوایی بوو کە هەرزەکارێکی بەسەزمانی بێ‌وەی بوو • جارێکیان کە شێتی دەیگرێ هەموو دانەکانی خۆی هەلدەکێشێ • لەبەرئەوە ئێسکێکی سەیری هەبوو لەبەینی پیرێژن و مندالی ساوا •

کە پیاوەکان بووکەکەیان هێنا ، منیش لە دووکانەوە بە پێ هاتمە خوارەوە ، پێلاوەکانم داکەند و دامە ناو ئاوە تەنکەکەی خوار ئاوایی و سەرکەوتم بۆ دێیەکە • من لە مالی خانەخوێکەم چاوەڕێم دەکرد • بەلاّم پیاوەکان بە ئۆتۆمۆبیل بووکەکەیان بە ڕێگایێکی دوورەوە هێنا و سواری ئەسپێکی سپیان کرد • لە دوورەوە چاوم لێ بوو پەچەیێکی سوور و زەردی دابوە سەریا •

بەلاّم من بەختم هەبوو لەگەل ئەورووپاییەکانی سەر پرۆژەی دووکان و دکتۆرەکەی نەخۆشخانەی دووکان بۆ نانی شایی بانگ کرام •

لەسەر سەربانە قوڕەکەی مالی زاوا فەرش و بەڕە ڕاخرابوو •

خواردنەکە بریتی بوو لە پلاو و گۆشتی مەڕ و ماستاو و چـای • قاپەکان هەموو خرابوونە سەر سینی گەورە گەورە و پیاو خزمەتی دەکرد • لـەو ناوە هیچ ئافرەتێ دیار نەبوو • بۆ ئێمە ئەورووپـاییەکان و دکتۆر مێز و کورسی لەسەر سەربانێکی نزیك دانرابوو • لەپێشا دەبوایـێ دەسمـان بشۆین • ئێمە چینجکمان دادەدا و یەکێك بە مەسینـە ئـاوی دەکرد بـە دەسمانا و ئاوەکە لەناو لەگەنێکی مس کۆدەبوەوە • لەپێشـا ویستمان وەك خەڵك بە دەس نان بخۆین ، بەڵام پاش تاقیکردنەوەیێکی کورت زوو وازمان لێ هێنا • چێشتەکە وەکوو هەموو شیوێکی کوردەواری خۆش و بەتـام بوو • ئەو دەمە سەرەتای هاوین بوو ، لەبەرئەوە پێمان دەکرا نیوەڕۆ لـە دەرەوە لەژێر هەتاو دانیشین •

**هەڵپـەڕکێ :**

ئێمە هێشتـا لـە خواردن نەبووینەوە پیـاوەکان هەڵپەڕکێیـان دابەست و لە جێگایێکی بەتـاڵ دەسیانکردە هەڵپەڕین • دەس لەناو دەس شان بە شان نیوە جغزێکیان دروستکردبوو ، بە هەڵپەڕین لە ناوەڕاستی جغزەکە نزیك دەبوونەوە و دووردەکەوتنەوە • هەندێ کەس بۆ گۆرانیبێژ و شمشاڵ و دەهۆڵ لێدەر پارەی فڕێدەدا و هەتـا پـارە فڕێدان بمـایێ هەڵپەڕکێ دەوامی دەکرد •

**چووین بۆ بینینی بووك**

لەپاش خواردن ئافرەتە ئەورووپاییەکان ئیزن دران بچـن بووکەکە ببینن • ئێمە لەسەربانە بەرزەکەوە زۆر بـە ناخۆشی هاتینـە خوارەوە • چونکە لە باتی پێپیلکە تەنەکەیێکی بەتاڵ دانرابوو کە دەجووڵایـەوە • بووکەکەیان بردبوە ژوورێکی بچووکی تاریکەوە لەو خانوە کە پیاوەکان نانیان لێ خوارد • لە زەوی لەسەر دۆشەگیك دانیشتبوو و پشتی لە کوتێك

بوو لە دیوارە ئەستوورەکە کە لە خشتی کاڵ دروستکرابوو و پەنجەرەکەی شووشەی تێنەخرابوو • منداڵان بە سەرە خرەکانیانەوە بە سەیرو خۆشیەوە تەماشایان دەکرد • بووکەکە لە بەردەممان هەڵسا و هێشتا پەچە ئـاڵەکەی لەسەر بوو • کەوایێکی درێژی ســورمەی ســوور و زەرد و زیورەنـیـگی لەبەربوو • وا دیار بوو دەستووری دەس گوشینی نەدەزانی و تێنەدەگەیشت چۆن بیکا، لە ژوورەکە دوو ئافرەتیتریش هەبوون، یەکێکیان خەریك بوو چای ئامادە دەکرد، ئەوەندە بە خشڵ خۆی رازاندبوو، لەدەمی چای تێکردن، چای هێنان یان پیاڵە شۆرین خرەی بازنگەکانی دەهات • ئێمە ــ ژنـە ئەوروپاییەکان ــ لاقە ناشیرینەکانمان خستە ژێرمان و لەسەر دۆشەگ بۆی دانیشتین • چــای و جغارەیان بۆ هێناین • لە تاقێك رادیۆیێکی ترانسستەر کرابوەوە و خرابوە سەر بڵاوکردنەوەی کوردی بەغدا و بە بێئەوە کەس ئاگای لێبێ و گوێی لێبگرێ هەر بۆ خۆی هاوار و قرەی دەکرد • من ناچار بووم رادیۆکە داخەم •

سەنووقی بووکێنی لە قوژبنێك دانرابوو ، وا دیاربوو لە بـازاڕی سولەیمانی لە دار تەختەی ســەنووقی چــای و ســابوون و شــتیتری دروستکرابوو • چونکە وشە و وێنەکانی بە پیتی ڕەش هێشتا لەسەر بوو، سەنووقەکە پێی بەرزی هەبو و پێشەوەی شووشە بوو کە بە وێنەی گوڵ، مێوەو گیانلەبەری باڵداری پیرۆزی ئیسلام (بوراق) ڕازابوەوە • وێنەکان رەنگی منداڵانەی ئاڵ ، لیمۆیی و شینی هەبوو • منداڵێك یان پیکاسـۆ Picasso لەوە باشتری نەدەکرد •

بۆیان گێڕاینەوە بووکەکە جارێکیتریش شووی کردوە • بەڵام زاوا بۆ هێنانی مارەیی ێکی زۆری دا • گوتیان بووکەکە تەمـەنی ٢٦ ســاڵە و ئەمەش نەختێ زۆرە بۆ بووکێك •

لەپاشان پاش نیوەڕۆ ئەسپە سپیەکەی بووکم دی کە زینـەکەی و

لبادەکەی ژێری ڕازابوەوە • لاوێك سواری بووبوو دەیبردەوە ئەگەر سەرو مشکیەکەی و پشتوێنە ئەستوورەکەی نەبوایێ من وام خەیال دەکرد ئــەوا سەدەکانی ناوەندە بەسەر ئەسپەوە بە چوارناڵە تێدەپەڕی •

**لەپێشدا دوو حەفتە بێ‌تەرجومان بووم**

ئەمە ئەو گوندەیە کە لەوێ لە ماڵی شێخ نزیکەی مانگێك مامەوە • نزیکەی دوو حەفتە لەوێ بەتەنیا بێ تەرجومان ( واتا وەرگێڕ ) ژیام • چۆن ئەو ماوەیە توانیم لەگەڵ ژنەکان بدوێم و ڕابوێرم ئێستاش ســەرم لــێ سوورِ دەمێنێ و خەڵکیش کە بەمەیان زانی واقیان وڕما • بەڵام من دەتوانم بڵێم نەزانینی زمانی یەکتری هیچ جارێ نەبوە کۆسپ و تەگەرە لەبەینمان و بە هیچ جۆرێك نەبوە هۆی ئەوە لەگەڵ یەکتریا بە خۆشی نەژین و پێکەوە ڕانەبوێرین • من چەند وشەیێکی کوردی فێر بووم • بەهۆی ئەو وشانە و نیشانەوە (واتا ئیشارەتەوە) توانیمان لە یەك بگەین • ئێستــاش قســەی دێنمارکی (سۆ سۆ So So ) واتا (وەهایــە ، وایــە) لــە گــوێ دەزرنگێتەوە کە دایك و کچ فێری بووبوون و دەیانگوتەوە •

دێتە بیرم جارێکیان لەگەڵ دایك و کچ چووینە ناو ڕەزەکان کە لــە سەرەوەی دێیەکەن • ئەمە گەڕانێك بوو بەدەگمەن دەمانکرد • لــەوێ لەسەر شاخ پێم‌هەڵخلیسکاو بەسەر دەمما کەوتمە ناو بەردو دەمم خوێناوی بوو • دایك و کچ هەردوکیان زوو پێم‌گەیشتن ، هەڵیانگرتم و دەمیــان پاك کردمەوە و دانەکانیان ژماردم • لەپاش ژماردن گوتیان «خێر بوو ، خێر بوو • شوکری خوا دانەکانت هەموو ساغ و تەواون و تێك‌نەچوون » لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆری قسەکانیان تێ‌نەدەگەیشتم ، هەستی گەرمی دڵچاکی و خۆشەویستیانم کرد • بەڵی بە دوو زمان قسەکردن ناخۆش و گران بوو ، بەڵام ئێمە دەمانتوانی تەنیا باسی شتی ماددی بکەین ، شتیوا کە بە دەس بگیرێ و بە چاو ببینرێ • قسەکردن لەبابەت شتی قووڵەوە وەك بیر (فکر)،

ڕەوشت و دەستوور دواخرا بۆ ئەو ڕۆژە باشترانە کە ئافرەتە تەرجومانەکەم پەیدا کرد و هاتە ناو ژیانمەوە •

## هاتنی تەرجومان

ناردم بەدوای تەرجومانەکەما لە سولەیمانی و ئەویش لەگەڵ براییك و شووبرای هات • براکەی بۆ ئەوە هاتبوو لەگەڵ خوشکەکەی بمێنێ • شووبراکەیشی بۆ ئەوە هاتبوو تەماشای بارو شوێنی ژیانی ژنەکە بکا • خانەخوێ لە سەرەتاوە دوو ژووری بۆ من تەرخانکرد ؛ ئەو ژوورانە کە لەپێشدا بۆ میوانی پیاوان دروستکرابوون • لەبەینی هەردوو ژوورەکە دالآنێك هەبوو کە کولەکەی داری سپیدار بنمیچەکەی ڕاگرتبوو • ئەم دالآنە هاوینان بۆ نووستنی مێوان تەرخانکرابو • ئەم بەشەی خانوەکەی شێخ جیاواز بوو لە ڕێگاوە ڕاستەوخۆ مرۆڤ دەیتوانی پێی بگا • کە ئێواران دەرگا دارینەکەی حەوشە دادەخرا ، ئیتر ئەم دو ژوورە بەجارێ لە خانوەکە دادەبڕا و بارێکی تایبەتی وەردەگرت • خانەخوێ یەکێك لە چارپایە ئاسنینەکانی هێنا بۆ نووستنی من ، چونکە هێشتا فێری ئەوە نەبووبووم لە سەر بان بخەوم • تەرجومانەکەم و براکەی چوونە ژووری دووەم • ئەمان نوێنی خۆیان پێ بوو • دۆشەگەکانیان لەسەر زەویە چیمەنتۆکە ڕاخست و بە لێفە دەنووستن • شەوان شووبراکە لە هەمان ژوور لەسەر تەخت دەنووست • ئەمەش لەناو موسولمانەکان ڕەوایە و دەشێ ژنێك لەگەڵ شووبرای لە هەمان ژووردا بنوێ ، چونکە مەحرەمی یەکترین و لە یەك مارە ناکرێن •

## شایی دووەم

لەپاش ماوەیێك شاییێکیتری لە ئاوایی ڕێکخرا بەڵآم ئەمجارە باری من (واتا وەزعی من) لە کاتی شاییەکەی پێشوو تەواو گۆڕڕابو • ئەمجارە

پێویست نەبوو من لەگەڵ ژنە ئەوروپاییەکان لە سەربان دانیشم و بە دانیشتن لەسەر کورسی نانەکەم بخۆم و تەماشای هەڵپەرکێی پیاوەکان بکەم • ئەمجارە من بووبوومە ئەندامێك لە ماڵێکی کورد ؛ ماڵی هەرەبەرزی ئاوایی • ئەمجارە لەگەڵ ئافرەتانی ئەم خێزانە دایك و کچ و تەرجومانەکەم توانیم لە بەرچاو هەموو ژنانیتری بچمە لای بووکەکە • ئێمە وەك بەرزترین ئافرەتانی ئاوایی بەخێرهاتنمان لێ کراو تەرجومانەکەو من لە خۆشیا بست بست باڵمان دەگرت • لە ماڵی شێخەوە بە پێ چووینە ماڵی بووك • ڕێگایێکی تایبەتی نەبوو • ئێمە کە باشترین و جوانترین بەرگمان پۆشییوو دەریەست بووین بەناو بەردو خوڵی گەلیێکا بڕۆین کە لە دەمی زستاندا ئاوی پێدا دەڕۆیی • پێپیلکەکان کە ئێمەی دەگەیاندە ماڵی بووك هەر ناوی پێپیلکە بوو ، بە تۆپەڵە قورو بەرد ، خوارو خێچ ، بەرزو نزم دروستکرابوون • بەسەریا چووین ، بەتایبەتی بە تاریکی ، زۆر ناخۆش و بەتالووکە بوو •

هەرچۆنێ بێ ئێمە بە سەلامەتی گەیشتینە نهۆمی دووەمی خانوویێك کە بووکەکەی لێ دادەبەزێ • ژوورەکە وەکو زۆر ژووریتری دیهاتی کورد دیوارێکی نەبوو واتا پێش خان بوو نە کونی لێ بوو نە پەنجەرە • بەڵام ژوورێکی فێنك و بەسێبەر بوو لە تەنیشت سەربانی ژوورەکانی نهۆمی یەکەم بوو • دەرگای خانوەکە لە خوار ئەو سەربانە بوو کە دەگەیشتە ئەو نهۆمە • لێرە گوندەکە لەسەر زەوییێکی لێژ دروستکرابوو • خانوەکانیش ــ بە بێ پلان ــ یەك لەسەر یەك بوون ، سەربانی خانووی خوارەوە دەبێتە پێشی خانووی سەرەوە •

کەرەستەی خانوو لە کوردستان وەك باکووری ئەورووپا لە ڕووی زەمین وەردەگیرێ • خانوەکان هەموو بە خشتی کاڵ دروست دەکرێن و بە قوڕ ماڵە دەدرێن • لەبەرئەوە خانوەکان ، گۆزە و شەربە قوڕینەکان کە بە دەس بە بێ چەرخ دروست دەکرێن لەگەڵ دیمەنی ڕووی زەمینی ئەو

ناوه فەرق ناکرێن • دیوارو سەربانەکان هەندێ جار خوارن • لە بەینی ڕیزە خانوەکان ڕێگای تەسك و خوارو خێچ هەن کە بەردەلانین و مرۆڤ زۆر بە ناخۆشی دەتوانێ پێدا هەلکشێ و لە دەمی زستانا ئاوی پێدا دەڕوا •

## ژووری کۆبوونەوەی ژنـان

یەکێك لە ژوورەکان ــ وەکو لەپێشەوە گوتم ــ دیوارێکی نەبـوو واتا پێش‌خان بوو • زەویەکەی بە فەرش داپۆشرابو و بە قەراغ دیوارەکانیا دۆشەگ ڕاخرابوو • ژوورەکە لە ژن و منداڵ جمەی دەهات • ژنـەکان بە چوارمەشقی یان لەسەر لاقیان دانیشتبوون و هەریەکە جێگاییەکی زۆر کەمی گرتبوو • ژمارەیان وابزانم لە پەنجای تێپەڕ کردبوو ، بەلام هێشتا بۆ کۆرپەکانیان جێگا مابوو ، ئەو کۆرپانە کە هاوڕێی نەبڕاوی هەمـوو کۆمەلە ژنێکن • لەپاشا منداڵ و ساوا لێرە جێگا ناگرن : لە کۆشی دایکیان دادەنیشن یان لەبەر مەمکیانـن • هەندێکیانیش لەناو ئافرەتەکان جێگایان بۆ خۆیان دۆزیبوەوە و سەرەتاتکێیان بوو •

کە چوومە ژوورەوە زانیم دوو ئافرەتەکەی مالەکەم بێ‌گومـان لـە چینی بەرزی دێیەکەن • ئەمە لە بەرگەکەیان دیار بوو • بۆ ئەم شاییـە خۆیان باش پۆشتە کردبوو • لای من بەرگی هەموو ڕۆژەی ئاوایی لـە پۆشەکی پەرداخی سولەیمانی باشترە • کراسەکان وەك هی تەرجومانەکەم لە توولی سورمە کرابوون کە لە سولەیمانی کڕرابوون و بەپێی تازەترین مۆدە بوو ، بەلام لە توولە تەنکە ڕووناکەکەوە کە تەواو دیودەر (واتا شفاف) بوو شەرواڵەکانیان دیار بوو و هەستی ئەوەم دەکرد تەنیـا نیـوەی لەشیان داپۆشراوە • ئەم مۆدە شارستانیە هەموو جۆری پۆشەکی کوردی گۆڕی• بەلام ئەمە لە شاری سولەیمانی بە جوانترین و لایقترین بەرگ دادەندرا •• تەرجومانەکەم بەپێی تازەترین مۆدەی سولەیمانی خۆی پۆشیبو و هەردو ئافرەتەکەی مالەکەم چاویان لێ کردبوو •

**ئـافرەتەکانی هاوڕێم :**

ئەم سێ ئافرەتە کە لەگەڵما بوون بە بەرگە جوانەکانیان کارێـکی زۆریان کردە ژنانی دێیەکە. لەپاشا ئەمان لە خەڵکی دێ سپیتر بوون. دایك و کچ هەردوکیان سپی بوون چونکە لە دەرەوەی ماڵ کاریان نەدەکرد کە تینی هەتاو بۆریان کا . بەڵام پرچ و چاویان ــ وەکوو ژنانیتری ــ تەواو ڕەش بوو .

ئەم دوو ئافرەتە لە ماڵەوە لە حەوشە نانیان دەکرد و چێشتیان لێدەنا و بەهاران کە ڕان دەهاتەوە حەیوانیان دەدۆشی . بەڵام هاوینان کە ڕانەکە دووردەخرایەوە و شوان دەیبرد بۆ ناوشاخ ، ئیتر ئەم دوو ئافرەتـە وەك ژنانیتری بۆ دۆشینی مەرو بزن نەدەچوون . ئـەم کارە سپێررابوو بـە کچێکی بەردەست . لەپاشان ئەم دوو ئافرەتە وەك ژنانیتری ناو دێ لەگەڵ کەرو پاچ بۆ سووتەمەنی کۆکردن بۆ شاخ نەدەچوون . ئەمەش ئـەرك و فرمانی (واتا وەزیفەی) کچە بەردەستەکە بوو. ئەمە ئیشێکی زۆر قورس بوو، لەژێر تینی رۆژا ٥ ــ ٦ سەعاتی دەخایاند . لەپاشا ئەم دوو ئافرەتـە وەك ژنانی دیکەی ناو دێ دەسیان نەدەدایە جووت و درەو ، گەنمی درەوکراویان کۆنەدەکردەوە و بۆ خەرمان نەیاندەبرد . زەویەکانی شێخ ئایا دێم بێ گەنم و جۆی تیا بوەشینرێ ، یان بەراو بێ تووتنی تیا بکرێ ، لەلایەن مسکێنەکان و ژنەکانیانەوە جووت دەکران و لەپاشا بەرهەمەکە کۆدەکرایەوە . شـێخ خاوەنی ئەو دێیە و چەند دێیێکیتری بوو . ژن و کچەکانی لـە خەڵکیتـر باشتر دەژیان ، خەریکی ئیشی بەر هەتاو نەدەبوون ، لەبەرئەوە رەنگیـان سپیتر و دەسیان نەرمتر بوو .

ئەم دوو ئافرەتە بەدەگمەن ماڵیان بەجێدەهێشت . بەڵێ هەندێجـار بۆ کۆکردنی پیازو سەوزەیتری دەچوونە نزیکترین باغ . جارێکیانیش ــ کە لەپێشدا باسمکرد ــ چووین بۆ ناو رمزەکان لە قـەدی شـاخ بـۆ

کۆکردنی گەڵا مێوی ناسك بۆ لێنانی یاپراخ . بێجگە لەم ئیشانە هەموو دەمێ لە ماڵەوە دەمان .

ئافرەتەکانی هاورێم لەناو ژنەکان ئاشکرا دیار بوون : کچی شێخ لەبەر جوانی ، دایکی نەك لەبەر زەلامی لەش لەپاش پێنج منداڵ ، بەڵکو زیاتر لەبەر خشڵە زۆرەکەی کە خۆی پێ رازاندبووەوە . پارچە پارچەی زێر نرخیان لە سەد دینار زیاتر لە فێسە سورمەدارەکەی شۆڕبووبووە خوارەوەو زنجیری زێری ژێر چەناگە کە فێسەکەی رادەگرت . بێجگە لەوە ملوانکە و بازنگ و شتی نایابی‌تری لە خۆی دابوو .

### ژورەکە لە ژنـان جمەی دەهات

ژورەکە پڕ بوو لە ژنان ، بەڵکو لە ژنان جمەی دەهات . زاوا کە کوڕێکی لایقی ٢٥ساڵان بوو رانك و مرادخانی لەبەر بوو و کڵاوێکی ڕەنگاوڕەنگی لەسەر نابوو ، هات و بەخێرهاتنی لە هەموان کرد . دایکی ئافرەتێکی پەككەوتووی کۆنی بێدان بوو . تەمەنی لەوانەبوو لە ٤٥ ساڵ تێنەپەڕێ و ڕەنگی وەكدار بەڕوو ڕەشتاڵە بو . لەگەڵ ئەوەشدا هاتبوە شایی کوڕەکەی و بەرگی سادەی پۆشیبوو . مێردەکەیشی کە ڕەنجو زەحمەت‌کێشان زوو پیری کردبوو ، زۆر بە سادەیی خۆی پۆشیبوو . ئەمیش دانی نەمابو و لە تەمەنی خۆی پیرتر دیار بو . لەسەر یەکێ لە دۆشەگەکانی قەراغ دیوار باشترین جێگا بە ئێمە درابو و لە تەنیشتمانەوە جێگا بۆ بووکەکە دیاری‌کرابو . تەپلەکێکی بچووکی جغارە لە پێشمان بو و بە ئیستکانی زێرین ـ کەوا دیار بوو لە بۆهمیە Bohemia دروست‌کرابو ـ پەیتا پەیتا چاییان بۆ دەهێناین . ئافرەتێکی بچووکی پانزە ساڵانی شووکردووی سووكو شیرین خەریك بوو ، بە بێدەنگی و لەسەرخۆ دەجوولایەوە ، چای دەهێناو ئیستیکان و ژێر پیالە بەتاڵەکانی دەبردەوە .

سەروپێچێکی زلی لە سەر نابوو و سەرپۆشێکی سپی دادابووەوە بەسەریاو وەك ئافرەتێکی بەویقار دەجوولایەوە و لەوە ورددەبوەوە کێ هێشتا چای شیرینی قورسی تەواو نەخواردوەتەوە • کەواییێکی درێژ و شەروالێکی زلی پۆشیبو و بەخۆشیەوە ، بە بێ ئەوە لە کەس بکەوێ لەناو حەشاماتەکە ، ئیشەکەی جێ‌بەجێ دەکرد • کۆمەلێك لە کچی هەرزەکار دەورەی کچی شێخیان دابوو • هەموو بەرگی جوانیان پۆشیبوو ، بەلام لە بەرگەکەی ئەو جوانتر نەبوو • هەموو لە چاو کچی شێخ ڕەشتالە بوون ، ئەو کچە کە بەدەگمەن لە دەرمووەی مالەکەی دەبینرا • ئەمانە بەهۆی ئەم شاییەوە یەکیان گرتبو ، پسە پسیان دەکرد و پێکەوە پێ‌دەکەنین •

جێگایێك بە من درابوو لەسەر دۆشەگەکە لەتەنیشت ئەو جێگایە کە بۆ بووکەکە دانرابوو • جارێکی‌تری من حەزم دەکرد لاقم نەبوایێ یان ئەوەندەی ژنە کوردەکان نەرم بوایێم و بمتوانیایێ وەك ئەوان لەسەر لاقم باش دانیشم • من جێگای دوو کەسم گرتبوو پەیتا پەیتا بەملا و ئەولادا خۆم دەچەماندەوە بۆئەوە کە کەمتر جێگا بگرم‌و نەختێ بە ڕەحەتی دانیشم •

ژنان لە دێهاتی‌تریشەوە هاتبوون • ئەمانە لووتەوانەیان لە لووت کردبوو و روویان بە خال یان هێل (واتا خەت) کوتابوو •

هەموو ژنەکان بەرگی زۆریان پۆشیبوو • لەسەر کراس و کەواوە سوخمە یان چاکەتیان لەبەرکردبوو • شەروالە زلە فراوانەکانیان کە لە خوارەوە گورمیلە دەبوو پارچە جلێکی زۆر گەرم بوو •

ژنە مارەکراوەکان فێسیان لەسەر بوو کە بەهۆی چەند سەرپۆشێکەوە دەورە درابو • پەچەی سەر کە لە سەرمووەی هەموو بوو گەرمی زیاتر دەکرد •

من کە لێیان ورد دەبوومەوە و ئارەقە دلۆپ دلۆپ بەسەر ڕوومەتما

دەهاتە خوارەوە لە دڵی خۆما دەمگوت «نازانم چۆن لە گەرما نامرن ! »
لەگەڵ ئەوەشدا من نە شەروالی درێژم لەبەر و نە سەرو پێچی زلم بەسەرەوە
بـوو •

**دواکەوتنی بووك**

هاتنی بووك دواکەوت • دەبوایێ ئەو لە سولەیمانیەوە بـۆ تۆپژاوە ڕێگایێکی دوور ببڕێ • هێشتا ئەو مێردەکەی دواڕوژی نەدیبو ، ئەمیش هێشتا بووکەکەی نەدیبوو • تەماشامکرد شتێکی بچووکیان خستە ژێـر ئەو دۆشەگە کە بووکەکە هات ، لەسەری دائەنیشت • شتەکە بریتی بـو لە نەختێ هەنگوین کە بە نانی تیری پێچرابوو • مەبەست لەمـەش ئەوەبـوو بووکەکە وەك هەنگوین شیرین بێ • ئەمە دەرمانێکی کۆنی کوردەواری بوو ، تاقیکرابوەوە و هەموو جارێ ڕاست دەردەچوو •

کات ڕابوورد و ڕۆژ کەوتە درەنگی • لەگەڵ ئەوەشـدا پەیتـا پەیتا چایمان دەخواردەوە و تەواو برسیمان بوو • سەعات دوو نیو بو و ئێمـە لە سەعات حەوتو نیومو لەوێ بووین •

ناتوانم بڵیم من وەرس بووم • بەخۆشیەوە تەماشای ڕاست و چـەپم دەکرد • بەرگی جوانی ڕەنگاوڕەنگی منداڵانی بەرمەمکەم زۆر پێ سەیر بوو • کوڕە بچووکەکان جلی شەوی خەت خەت ، کچە بچووکەکانیـش جلی بچووکی ژنانەیان لەبەر بوو • لەبەرئەوە بۆ مـن زۆر شـت هەبوو تەماشای کەم •

**گەیشتنی بـووك**

لەدواییدا وا دیار بوو شتێك ڕوودەدا • دەنگە دەنگ پەیدا بوو و ریزێك خەڵك لە سەربانەکەی سەر دەرگا خۆیان دەرخست • قەمەرەکان کە بووك و ئەو پیاوانەیان تێدا بوون کە لە سولەیمانیەوە لەگەڵی هـاتبوون

دەرکەوتن • ڕێگاکە خراپ و تەسك بوو • ڕێبوار و حەیوان بەئاسانی پێدا دەڕۆیشتن ، بەڵام قەمەرە بە زەحمەت و تەنیا لەندرۆڤەر Land-Rover و پاسی بچووك دەیانتوانی بەئاسانی تێیەڕن •

بەڵام لێرە دەستوورێکی شایی هاتە مەیدان ، ئەویش تێپەربوونی ریزێ قەمەرە بوو کە بووك و پیاوانی تێدابوو • ئەمانە بەناو چەمە وشکەکەدا تێپەرین و هەڵکشان بۆ سەر ئاوایی •

زاوا لە قەراغ سەربانەکە لەگەڵ دوو هاوڕێی ڕاوەستابوو دار گزگێکی پێ بوو خەریکی ڕێك و لووس کردنی بوو • چەند ژنێکیش کەڵەشێرێکیان پێ بوو • دەستوورێکی کۆنی کوردەواری‌یە ، کە بووك لە بەردەم ماڵەکەی دوارۆژی دەرکەوت کەڵەشێرێك سەردەبڕێ • بەڵام ئێستا کەڵەشێرەکە سەرنابڕن ، بەڵکو لە سەربانەوە بەسەر سەری بووکەکەدا بەرەڵلای دەکەن • کە ئەمە کرا هەموو ژنەکان هەڵدەستن و دەچنە سەربانەکەی بەردەم ژووری بووك •

هاوار پەیدابوو «ئەوە بووك هات» • هەمان دەنگی پڕئەفسوون لەگوێما زرنگایەوە کە لەلای ئێمە بووك لە کەنیسە دەردەکەوێ و خەڵك بە یەکتری دەڵێن « ئەمە بووکەکەیە » •

زاوا بە دار گزگەکەیەوە لەگەڵ هاوڕێکانی لە قەراغ سەربانەکە ڕاوەستابوو • بۆئەوە باش چاوم بە ڕووداوەکە بکەوێ منیان پێش‌خست و گەیشتمە لایان • ئەو ژنانە کە لەپشتمەوە بوون ئەوەندە پاڵیان پێوە نام زۆری نەمابوو لە سەربانەکە بکەومە خوارەوە • ناچار باڵم کرد بەناو قەد ئەو ئافرەتەدا کە لە تەنیشتمەوە بوو کە ناوی (نەعیمە) بوو • نەعیمە ئافرەتی ماڵەکە بوو ، دایك بوو و خۆی باش ڕازاندبوەوە •

ئێمە دوو کۆنە دایك یەکتریمان قایم گرت نەك بکەوینە خوارەوە •

بەڵێ زمانی یەکتریمان نەدەزانی • بەڵام لەکاتی‌وادا زمان پێویست نەبوو • هەردوکمان کاتی هەرزەکاری ، عازەبی ، بووکینی و منداڵبوونمان بەسەرچووبوو • لەوێ راوەستابووین بۆئەوە کە چاومان بە ئافرەتێکی جاهێل بکەوێ کە نەك تەنیا لە پێشخانی ماڵەکەی دوارۆژی تێدەپەرێ ، بەڵکو دەچێ بۆ گرنگترین بەشی ژیانی •

بووکەکە لە قەمەرە دابەزی • دوو ژن ژێر باڵیان گرتبوو ، وا دیار بوو لەبەر زۆری بەرگەکەی بە گرانی دەڕۆیی • من لەژێر پەچە تاڵەکەوە چاوم لێ بوو ، لێوی سوور کرابو • کەلەشێرەکە بەرەڵلا کرا و لە سەربانەوە فڕێدرایە خوارەوە•زاوا دار گزگەکەی بە هەردوو دەستی گرت و هاوڕێکانی دوورخستەوە بۆئەوە کە ماوەی هەڵسووڕاندنی هەبێ و ئینجا بە هەموو هێزی دارەکەی هەڵسووڕاند و بۆلای بووکەکەی فڕێیدا • لەوکاتە کە بووکەکە گەیشتە بەر خانەکە دارەکە لە سەری کەوت •

بهاتایە ئەو دوو ژنەی لەگەڵا نەبوایێ کە ژێرباڵیان گرتبوو ، بووکەکە دەکەوت • تەماشام کرد فێسێکی رەشی لەسەرە کە بە سەرپێچ پێچرابوو • لەپاش چەند رۆژێ پێیان‌گوتم لێدانەکە توند بوو و بوە هۆی پەنمانی لایێکی سەری • مەبەست لەم لێدانە گوایا دوورخستنی خراپە بوو •

**بووکەکە لە ماڵەوە لەناو ژنان :**

هاوڕێکانی بووك بەسەر پێپیلکە قوڕینە چەوتەکانا رایانکێشاو سەریانخست • کە گەیشتە بەردەم ماڵەکەی هەموو ژنەکان لە سەربانەوە بۆ پێشوازی هاتن • هاوڕێکانی گەیاندیانە ژوورەکە و لەسەر دۆشەگەکە دایان‌نا • دایکی زاوا هات بەسەریا شۆڕ بوەوە ، دەستەکانی خستە سەر شانەکانی و تەوقی سەری ماچ‌کرد • ئینجا پەچەکە لابرا •

ژنان هاژەیان کردە سەری تاکو بزانن ئەم ئەندامە بچووکە تازەیەی

دنیەکەیان چۆنە ! ئەمە بەجارێ نەبەهێشت هەوای پاك بگاتــە ئــەم کچــە بەسەزمانە کە ئەوەندەی نەمابوو لە هۆشی خۆی بچێ • خواو ڕاستـــان یەکی لە ژنەکان باوەشێنێکی پەیداکرد و بۆئەوە کە بێتە هۆش خۆی باوەشێنی کرد • من بە هەموو دڵمەوە لەمبارە ناخۆشە دڵگیر بووم و دڵم پێ سووتاە یەکەم زۆر زۆر لە سنوور بەدەر بەرگی لە خۆی پۆشیبوو ، دووەم ســێ سەعات لە سولەیمانیەوە بۆ ئەوێ بەڕێوە بوو • لەپاشا دار گزگەکە سەری پەنماندبوو • ئەمانە نەبوایێ بە رووخۆشیەوە دەهــاتە ژووری مالــەکەی دوارۆژی • لەپاشا کۆبوونەوەی ژنان لەسەری بوە هۆی کەمبوونی هەوای پاك و ئەوەندەی نەمابوو بخنکێ • لەسەر دۆشەگەکە خۆی چەماندبوەوە و بە جۆرێکی ناشیرین دانیشتبوو • ئەوەندە هێزی تیا نەمــابوو تەنــانەت ئەژنۆکانی لە یەك دوورخات و بە چوار مەشقی دانیشێت • هەندێ ئاویــان دایێ بیخواتەوە ، بەڵام بەسەزمانە تەواو ماندوو بووبوو • ســەیر بــوو دەموچاوی کریمی زەردو سپیان لێ دابوو ، لێوەکانیشی ڕەنگی سووری تێر ، سووری رەشتاڵە • ئێــسکی لە هەستیرەیێکی هونەرمەندی دەکرد کە یاریەکەی شەوی لە شانۆ تەواوکردبێ • لەپاش چەند رۆژێ دیم ، بەسەزمانە هێشتا ١٦ ساڵی تەواو نەکردبوو • دەمو چاوی جوان و رەنگی زێڕین بوو•

بەرگەکەی کە لەم گەرمای هاوینە پۆشیبووی بروا نــاکرێ چەنــد گەرم و قورس بوو • شەرواڵە زلە درێژەکەی لە سورمەی زەرد دروســت کرابوو کە نرخی گران بوو ، بەڵام کەرەستەکەی زۆر قورس بوو • لەپاشا گۆرەوی لە پێ کردبوو کە هاوینان لێرە لە پێی ناکەن • کەواکەی لــە توولێکی زەردی قورس دروست کرابوو • سوخمەکەی سورمەی سەوز بوو • لەسەرئەوەش لبادێکی سورمەی سوور هەبوو • لە سەرەوەی هەموو ئەمانەش لبادێکی درێژی سورمەی شینی لەبەر بوو • ئــەم هەموو شتەی لەم هاوینە لەبەر بوو کە پلەی گەرما لە ١٠٥ پایەی تێپەڕ کردبوو •

جار جار لە گەرمانا پارچە جلەکانی ژێرەوەی خۆی بەرز دەکردەوە • بەڵکو نەختێ هەوای فێنك بگاتە ناو لەشی •

لەپاش خواردنەوەی ئاوێکی زۆر لە جامێـــکی مس کچـەکە نەختێ هاتەوە هۆشی خۆی ، دانیشت و لبادە درێژەکەی داکەند • لبادە سورەکەی ناوەوە رەنگی دابوە دیوی ناوەوەی لبادە درێژەکە • وا دیار بوو هاتنەکەی لە سولەیمانیەوە بۆئەوێ لەناو قەمەرەیێکی داخراو بوو کە وەك گەرماوێك وابوو • ئەم هاتنە چەند سەعات درێژەی کێشا بوو • کە تەماشای لبـادە درێژەکەم کرد کە خرابوە سەر تەنافێك لە تەنشتیەوە چاوم بە سووز ُلەچ و شتی‌تری ناوماڵ کەوت • وادیاربوو بۆ ئەم رۆژە گرنگەی بووکەکەیـان ژوورەکەیان پاك نەکردبوەوە •

پاش ماوەیێك بو ئێمەی ئافرەتان چێشت هێنرا : قاپی چێشتەکـان لەسەر سینی گەورەی مس دانرابوو • چەند قاپێك قبوولی ، قاپێك شلەی تەماتە و سەوزە ، قاپێك گۆشتی مەڕی پارچە پارچە کراوو نانی تـیری • سینیەکان خرانە سەر زەوی و منداڵان زوو دەرکرانە دەرەوە • پیاوەکان ــ هەروەکو لەم وڵاتانە دەستوورە ــ چێشتی خۆیان زووتر خواردبوو • ئەو دەمە کاتی ژنان بوو • لەپاش ئەوان نۆرەی منـــداڵان دێ • چەنــد کەسێکمان لەسەر سینی‌یێك بەشدار بووین و هەرکەسە قـاپی تایبەتی خۆی نەبوو • لەناو چێشتە شلەکان تەنیا یەك کەوچك هەبوو ؛ دەبوایێ بە نۆرە بەکاری‌بینین • لەناو قاپی ماستاوەکەش تەنیا یەك کەوچکی دارینەی گەورە هەبوو ، دەبوایێ هەموو لەو کەوچکە بەشدار بین و بەنۆرە ماستاوی پـێ بخۆینـــەوە •

نانخواردن بە کەوچك یان بە پەنجەی دەس شتێـــکی رەوشـــت و راهاتنە • مرۆڤ دەتوانێ زۆر بە پوختەیی و باشی بە پەنجەی دەس نــان

بخوا • کەوچك و چەقۆ و چەتاڵەکانمان چەندی پاکن ! خوا دەزانێ • لەپاش شۆرین بە پارچە خاولیێکی تەنك وشکی دەکەینەوە • ئایا ئەم خاولیانە چەندێ پاکن ؟ تۆ دەتوانی دەستەکانت باش بشۆیت و ئاگات لە تەمیزییان بێ •

دەستەکانی بووکەکە بەهۆی کل و شیر کوترابوون • کل ( ئەنتمۆنی Antimony ) شتێکی کوتراوی رەشە ژنان چاویانی پێ دەرێژن ، بەمە چاوەکانیان جواتر دەبێ • لەپاشا سەرپەنجەکانی بووکەکە بە خەنە سوور کرابوو • بە خەنەش وێنەی مانگ و هەستێرە لەناو لەپی دەستی کرابوو • لەوانەیە پەنجەکان و ژێر پێیشی بە خەنە رەنگ کرابووبن ، وەکو پێیەکانی کچی ماڵمان کە چەند جارێ بە خەنەکراوی دیومە • بەڵام ئەم ـ وەکو لەپێشدا گوتم ـ گورەوی لە پێ بوو • خەنە رەنگێکی زەردی قاوەیی وەك رەنگی گێزەر دەدا • بە راستی خەنە رەنگێك دەداتە پێست زۆر لە رەنگی کارەبا دەچێ •

بووکەکە کەمی خوارد و لەگەڵ کەس نەدوا • کە مرۆڤ لێی ورددەبوەوە وای بۆ دەردەکەوت کە کچێکی زۆر نازدار بێ • زۆر پارچە زێری خستبوە سەر فێسەکەی و هەندێ پارچەی بچووك شۆر بووبوونە خوارەوە ، ئەمە بێجگە لە ملوانکە و بازنگ • بووکەکە بەئاستەم کامەران دیار بوو • لەپاشان ژنان تێیان گەیاندم بووك نابێ بەخۆیەوە شانازی بکا و کامەران و کەیفخۆش دیار بێ • بەڵکو دەبێ گران بێ و لە دوارۆژی ژیانی تازەی وردبێتەوە ، غەمی ئەوە بخوا چۆن ببێتە ژنێکی چاك و بەرێز و دایکیکی باشتر و بەرێزتر •

یەکێ لە ئافرەتەکان کە یەك چاوی هەبو و پووری بووکەکە بوو زۆر چالاك بوو • کە تەماشام دەکرد لە دڵی خوما دەمگوت وادیارە ئافرەتی یەکچاویش هەندێ جار جوان دەبێ • ئەم ئافرەتە خزمی دایکەکەی خانەخوێم

بوو و لە هەردولام دانیشتبوون • لەبەرئەوە بەسەر لاقەکانما دەسیان کردە گفتوگۆیێکی زۆر بەگوڕ • ئەم لاقانەم ــ داخەکەم ــ هەمیشە تەگەرە بوو لە ڕێگای باش دانیشتنم ، نان خواردن ، چای خواردنەوە و هەموو ئیشیکیتری کە لەسەر زەوی دەکرێ •

من لە پوورە یەکچاوەکە زیاتر سەرنجم دەدا لە ئافرەتی دووەم کە لەگەڵ بووکەکە هاتبوو • ئەمە ئافرەتێکی پیرتر بوو و ــ وەکوو زانیم ــ بۆ بەجێهێنانی فرمانێکی (واتا ئەرکێکی) گرنگ هاتبوو • پوورە یەکچاوەکە دەیتوانی بۆ هەفتەیێك لە ماڵی بووك و زاوا بمێنێ • بەڵام ئافرەتە پیرەکە دەبوایێ بەیانی بگەڕێتەوە بۆ سولەیمانی و دەبوو پارچە پەڕۆی بووکێنی لەگەڵ خۆی بۆ باوك و دایکی بووك ببا • ئەم پارچە پەڕۆیە دەبێ نیشانەی کچێنی بووکەکەی پێوە بێ • بێتو ئەم نیشانەیە ــ خوانەکەران ــ نەبێ ، لەوانەیە کچەکە لەلایەن باوکی ، برای یان خزمێکیتری تێرینەیەوە بکوژرێ • پیرێژنەکە دەبێ لەبەر دەرگای ژووری بووك بنوێ• چاوم لێ بوو نوێنی بووکێنی لەگەڵ دۆشەگ، سەردۆشەگ و سەنووقی بووك کە پێشەکەی شووشەی ڕەنگاو ڕەنگە ، ئەمانە هەموو خرانە ژووری بووك • بەرگەکانی بووك لەو سەنووقەدایە • ئەو بەرگانە و خشلەکانی کە خۆی پێ رازاندوەتەوە ••• ئەمانە هەموو بە پارەی مارەیی خۆی کڕاون • گوتیان ١٦ دەستەی تەواوی جلو بەرگی هەیە • بەرگی ژنان لێرە بەپێی مۆدە نیە ، بەڵکو ــ وەکو بەرگی نەتەوەیی ئەوروپا ــ بەپێی دەستوورە • لەبەر ئەوە بووکێك لە کاتی شایی دەتوانێ ئەوەندە دەستە بەرگ بکرێ و کۆبکاتەوە کە هیچ نەبێ بەشی دە ساڵی بکا • ئەم جلانە ، خشلەکانی و تفاقی ناو ماڵی کە بە پارەی مارەییەکەی کڕاون هەموو هیی خۆیەتی و لەکاتی جیابوونەوە ــ خوا نەکەران ــ هەموو ئەم شتانە بۆ خۆی دەمێنێ و دەتوانێ لەگەڵ خۆی ببا •

هەروەکوو لەپێشدا گوتم پیاوەکان لە زووەکەوە (لە مێژەوە) نانیان خواردبوو • ئەوانیش وەك ئێمە هەمان چێشتیان خوارد • لەپاشا دەسیان‌کردە هەلپەڕکێ • لەدورەوە گوێم لە دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا بوو• لەم شایی‌یە من لەناو ژنان بووم لەبەرئەوە لەبابەت شایی پیاوانە هیچم نەدی•

ئەو دەمە ئیتر پاش نیوەڕۆیەکی درەنگ بوو و کاتی ڕۆیشتنەوە هاتبوو• بابەتە سەرەکیەکانی شایی تەواو بووبوو • ئیتر بەسەر پێ‌پیلکە قوڕینە ناشیرینەکانا وردە وردە چووینە خوارەوە • بووکەکەمان بۆ دواڕۆژی خۆی بەجێ‌هێشت •

لەپاشا لە هاوین هەموو پیاوەکانی ئاوایی جارێکی‌تری بە ئۆتۆمۆبیل چوونە سولەیمانی بۆ هێنانی دوو بووکی زۆر گەنج • وادیارە لێرە هاوین وەرزی ژن‌هێنانی ئاوایی‌یە • من ئەو دەمە لەوێ نەمابووم ، چووبوومە مالی تەرجومانەکەم لە سولەیمانی • وا ڕێك‌کەوت یەکێ لە حەوت کچی ئەو مالە شووی دەکرد • لەبەرئەوە ئەمجارە نەك تەنیا لە شایی بەشداربووم ، بەلکو لە کارو کردەوەی ئامادەکردنی تفاقێکی زورو زەبەندەش هاوبەش بووم •

### مالێکی فراوانی کورد

لە هەندێ مالی کورد زۆر کەس دەژین • ژوورەکان گەورەن ، بێجگە لەوە حەوشە و سەربانیش بۆ خەوتن و نان‌خواردن بەکاردەهێنرێن • لە تۆپزاوە لە یەکێك لە ژوورەکانی بەشێك لە خانوەکە بووم ، ئەو بەشە کە لە ژوورەکانی‌تری جیاکرابووەوە • بەلام لە سولەیمانی لەناو مالەکە لەگەل ژن و کچەکان دەژیام • لەم مالە هیچ ژوورێکی‌وا نەبوو تەنیا بۆ مەبەستێکی تایبەتی بەکاربهێنرێ • ئەندامی مالەکە وەکو ڕەوەند و کۆچەر لە ژوورێکەوە دەچوون بۆ ژوورێکی‌تری و هەر ڕۆژە لە ژوورێك بوون •

نه شتی ناوماڵ و نەش ئەندامەکان جێگای زانراویان هەبوو • هەرکەسە
رۆژێ لە ژوورێك نانی دەخوارد و لە ژوورێك دەنووست • چێشت بـۆ
نیـوەرۆ و ئێـوارە لە ئـاگردان لێدەنرا و دەخرایـە سەر سینی گەورە و
لەکوێ بە باش دەزانرا دادەنرا و دەخورا • هەندێجار تەنیا بۆ من و یەکێ
تری لە ئەندامی ماڵ وەك تەرجومانەکەم بەتایبەتی نان دەهێنرا و لەسـەر
مێزێك ــ کە تەنیا مێزێك بوو لە ماڵەکە ــ نانەکەمان دەخوارد • لەبەرئەوە
من ژوور نەبوو نانم تیا نەخواردبێ • نووستنیش هەروەها • لە سەربـان
دوو چوارپایە هەبوو لەسەر یەکێکیان دەنووستم • بەڵام هەندێجار لـە
حەوشە یان ژووری مێوان دۆشەگێکم ڕادەخست و لەسەری دەنووستم •
بەڵام هەندێ جار کە ڕەشەبا هەڵی دەکرد دەربەست دەبووین لە سەربـان
بێینە خوارەوە • جارێکیان لەگەڵ ئەوەشدا ڕەشەبا هەڵیکردبوو من هەر
وازم لە سەربان نەهێنا • بایەکە ئەوەندە توند بوو ئەوەندەی نەمابوو من و
لێفەکەم فڕێداتە خوارەوە •

لە یەکێ لە ژوورەکان مێخێك لە دیوار بۆ شت هەڵواسین چەقێنرابوو و
بۆ من تەرخانکرابو • بەڵام هەندێجـار یەکێ لـە کچـەکان ئەمـەی
لەبیردەچوو و شتەکانی خۆی پێوە دەکرد • لەپاشا من جانتایێکی گەورەم
هەبوو شتەکانم دەخستە ناو نەمدەزانی لەکوێ داینێم و هەرجـارێ لـە
جێگایێك قایم دەکرا چونکە هەموو رۆژێ ژوورەکان بـۆ فێنـككردن
ئاوەرشێن دەکران ، هەرجارێك ئەم جانتایەم لە جێگایێك ، لە قوژبنێك یـان
لەسەر یەکێ لە سەنووقە گەورەکان دەدۆزیەوە • ئەم سەنووقانە کلیـل
درابوون و کلیلیان دەکرا بە پشت سوخمەوە • لەو مـاڵە گەورەیـە کە
١٤ ــ ١٥ کەسی تێدابوو ئەوشتـانە کە زۆر غەمم بـۆ خوارد بپـارێزم
کامێرەکەم و ئەو دەفتەرانە بوو کە شتم تیا دەنووسین • بەڵێ لە دیوارەکان
تاق زۆر بوون ، بەڵام ئەم تاقانە بۆ شت قایمکردن دەستیان نەدەدا ، چونکە

لەم تاقانە هەمووشتێ هەبوو لە شووشەی دەرمانەوە هەتا بادەی ئـاو و تاسی سابوون • سەرەڕای ئەمە ماڵەکە لە منداڵ جمەی دەهات : منداڵانی ماڵەکە و دراوسێکان • لەبەرئـەوە وردە وردە جانتـاکەم سـووك کرد ، هەرچۆنێ بوو کامێرا و دەفتەرەکانم کە گرنگ بوون پاراست •

**لەم مـاڵە کچێك بە شوو دەدرێ :**

هەروەکوو لەپێشدا گوتم لەم ماڵە کچێك بە شوو دەدرا • لەبەرئەوە من نەك تەنیا وەك مێوان لە شـایی بەشـدار بووم ، بەڵـکو لە ئیش‌و ئامادەکردنی جیازی (واتا شتومەکی) بووکیشی دەمتوانی هاوبەشی بکەم • ماڵی زاوا لە دێیێکی دوور بوو وا بڕیاردرا لەپێشدا بووك و زاوا لـە خانوویێکی بەکرێ‌گیراو لە سولەیمانی بژین • لەپاشان بچنە لادێ ، لەوێ هەردوکیان مامۆستایی بکەن •

تەرجومانەکەم کە خوشکی گەورەی بووکەکە بوو ، لەگەڵ بووك و خوشکێکی‌تری و زاوا پێکەوە بۆ کرینی جیازی چوونە بەغدا • خوشکە بچووکەکە دەیویست بەغدا ببینێ • من لەگەڵیان نەچووم • هەندێ شـتی خەڵك‌نـاسی Ethnography م کڕیبوو ، ئەم شتانەم برد بۆ دووکان کە لەپاشان بۆ دێنمارك بینێرن •

لە بەغدا بە پارەی مارەیی کە نزیکەی ٥٠٠ دینار بوو دەبوایێ جیازی بووکێنی بکڕدرێ • دەیـاتتوانی خشـڵ لە سولەیمـانی بکڕن یـان بـە دروستکردنی بدەن • بەڵام بووکەکە حـەزیدەکرد هەنـدێ کورسی و قەنەپەی مۆدە ، تەختی سیسەم بۆ نووستنی هەردوك ، مێـزی توالێـت و کەنتۆر بکڕێ • ئەمانە هەموو بە دروست کردن دران • کەتـۆرەکە بـۆ بەرگی کوردی و مۆدە بوو • چونکە بووکەکە هەردوو جۆری پێویست بوو • هەندێ کورسی ئاسنیش بۆ ژووری مێوان بە کردن دران ، حەوزی

دەس‌شۆرین و دۆلکەیێك بۆ ژووری میوان کڕران • لەپاشان تفاقی چای و سەنووقی خۆجوان‌کردنیش Beauty-Box پەیداکرا • ئەمە سەنووقێکی پانی گەورە بوو بە قەدیفەی سوور داپۆشرابوو ، لە ناوەوە ئاوێنەیێك و چەند قوتوو و شووشەی جوان‌کردنی ئافرەتی تێدابوو • زۆر لە بووکە مۆدەکان ئێستا داوای سەنووقی جوانکردن دەکەن ، بەڵام پێشی شوو کردن نابێ بەکاری‌بێنن •

لەپاش گەڕانەوەیان لە بەغدا زۆرکەس لە بازاڕ و ماڵەوە خەریکی دروست‌کردن و ئامادەکردنی جیازی بوون • لێفەیێکی گەورەی‌وا لەگەڵ سیسەمی بووك ڕێك‌کەوێ بە دروست کردن درا • ئەم لێفەیە لێفەدوورێك لە بازاڕ دەیدووری و ڕووەکەی بە ئەتلەسی سووری نەخشدار دەڕازاندەوە • زۆر کەس لە بازاڕ ڕاوەستابوون بۆ تەماشاکردنی ئەم ئەتلەسە و ئەو نەخشە جوانانە کە لێفە دوورەکە بە دوورین لەسەری دەیکرد • یەکێ‌تری لە بەرگ‌دوورەکانی بازاڕ بە بڕین و دروست کردنی چاکەت و لبادی ڕەنگا ڕەنگەوە خەریك بوو • بەرگ‌دوورێکی ئافرەت هێنرایە ماڵەوە بۆ بڕینی هەندێ پارچەی بەرگ • ئافرەتەکە بە چوار مەشقی لەسەر زەوی دانیشت، دەستی کردە بڕینی چەند سوخمە و کەوا • کە هەموو بڕینەکە لەسەر زەوی تەواو بوو ، دایکی بووك و باوەژنەکەی کەللە شەکرێکیان هێنا و لەسەر قوماشە بڕاوەکان دەمیان کردە شکاندنی • من لە سەرەتادا وام‌زانی لەبەر تووڕەیی ئەمە دەکەن‌و ئەوەندەی نەمابوو دەسیان بگرم و نەهێلم قوماشە جوانەکان بدڕێنن • بەڵام دەسیان‌گرتم و تێیان‌گەیاندم مەبەست لەم کردەوەیە هێنانی بەختی چاکە بۆ بووك • ئەمەش بەشێك بوو لە دەستووری شایی سولەیمانی • لەپاشا ژنە بەرگ‌دوورەکە هەڵسا و پارچە قوماشەکانی لە کلۆ شەکرەکان پاك کردەوە و بۆ دوورین بردنیە ماڵەوە • مەبەست لە بڕینی قوماشەکە لە ماڵەوە ئەوەبوو هیچی لێ کەم نەبێ • هەندێ بلووری و

خامیشیان دایێ بو بڕینی کراس و دەرپێی فراوانی پیاوان • لەپاشا زانیم ماڵی بووك خەریکی ئامادەکردنی حەوت تاخم بەرگ بوون وەك کراس و گۆرەوی و بوینباغ بۆ حەوت تیرینەی خزمیان •

بەتانیەیێکی ئەتڵەسی سووری جوانی پەراوێزدار لەگەڵ دو ڕووسەرینی ڕەنگاو ڕەنگیش لە هەمان ڕەنگ لە بەغدا کڕران •

چاکەتێکی ناوماڵیش بو بووك لە هەمان کەرەستە واتا ئەتڵەسی سوور بە دروستکردن درا • پیشەی دوارۆژی بووکەکە مامۆستای لادێ و ژنی مامۆستایێکی لادێ بوو • هەردوکیان دەبوایێ لە دێیێکی بچووك و لەوێ لە خانوویێکی قوڕی سادە بژین •

لەدڵما لێکمدەدایەوە و دەمگوت ئەم جۆرە ژیانە چۆن دەلوێ و ڕێكدەکەوێ لەگەڵ ئەم هەموو جیازی‌یە گرانە کە لە کردەوەی پێشانگای بەناوبانگی La Dame aux Camélias ی ئەورووپا دەچێ •
سەرەڕای ئەم هەموو جیازی‌یە لە ئەتڵەسی سووری ئەستوور بۆ ژووری بووك پەردە دروستکرا •

لە ماڵی بووك سەنووقیکی ئاسنی بە سوور ڕەنگکراوم دی کە دەستێك بەرگی هاوینەی ئەورووپایی تێدابو کە بۆ زاوا کرابو • لەگەڵ ئەم بەرگە ، کراس و دەرپی ، گۆرەوی ، تاخمی تەراش ، خاولی و شتی‌تری هەبو • قوتوییێك چوکلێتیش دەبوایێ بخرێتە سەر جلەکان • ئەم سەنووقە سوورە ڕۆژێ پێش شایی دەبوایێ بدرێتە دەس پیرێژنیك بۆ ئەوە کە بیبا بۆ زاوا • پیرێژن هیوای دەکرد بەرامبەر ئەم دیاریە پاداشتێکی باشی پێ ببەخشرێ •

بەڵام هێشتا هەفتەیێك مابوو بۆ ڕۆژی گوێزانەوە و دەبوایێ زۆر شتی‌تری پێكبێ • هەموو خوشکە عازەبەکانی بووك دەبوایێ بەرگی

کورتی هاوینی مۆدە ، گەورەکان کە هەردوو ژنەکانی باوک بوون دەبوایێ کەواو کراسی تازەیان بۆ بکرێ • مەکینەی دورمان لەژێر دەستی خوشکی گەورە هەروا کاری دەکردو دەنگی دەهات •

ئەو تەنیا کەسە کە لە ئامادەکردن بەشدار نەبوو و وەکو گوێی بە هیچ نەدابێ وابوو ، بووکەکە بوو • کراسێکی شەوی سووری کالی درێژی لەبەرکردبوو کە زۆر پاك نەبوو و تەنیا لە ماڵەوە لەبەری‌دەکرد و لە حەوشە ڕادەوەستا • پاش نیوەڕۆوان دەنووست • کە بە هێواشی و دەنگ‌نزمی لەم بابەتەوە پرسیارم کرد ، لە وەڵامدا گوتیان : «بووك لە ماوەی پێش شایی نابێ هیچ بکا یان خۆی بگۆڕێ و شتی تازە لەبەرکا • بێتو خەریکی شتێك بێ خەزوورانی دەڵێن وادیارە کەسوکاری سوودی لێ وەردەگرن • بێتو خۆی برازێنێتەوە یان هەوڵێکی زۆر کەم بدا خۆی جوانتر بنوێنێ ، ئەودەمە ناوبانگی دەردەچێ کە حەزدەکا شوو بکا و گاڵتەی پێ دەکەن •»

بەیانیێکی زوو ڕەنجبەرێکی نیوە کوێر ، کە دوو گونیەی زەلام لۆکەی شی‌نەکراوە و هەموو کەرەستەی هەلاجی پێ بو ، هات و حەوشەکەی داگیرکرد و دەستی کردە هەلاجی کردنی (واتا شی‌کردنی) لۆکەکە بۆ دروست‌کردنی دۆشەگێکی گەورەی بووکێنی ، سەرینەکانی و دوو دۆشەگی‌تری • لەم ماڵە دەوڵەمەندە هەموو شتێ دەبوایێ تازە و باشترین بێ • حەزیان لە دۆشەگی حازری نەدەکرد و بە خراپی باسیان دەکرد و دەیان‌گوت کەس نازانێ چی تێدایە • لەم ماڵە مرۆڤ دەبێ دڵنیا بێ باشترین لۆکە بەکاربێنێ • لەبەرئەوە لۆکەی تازە کڕرا و هەلاجێك بانگ‌کرا بۆ شی‌کردنی لۆکەکە و خستنی بەناو بەرگە جوانەکان • کابرا بە چوارمەشقی دانیشت و دار هەلاجیەکەی دامەزراند و بە مێکوتەکەی دەسی‌کرد بە لێدانی ژێیە توندکراوەکە • بەمە لۆکەکە دەکرایەوە و شی‌دەبووەوە •

ئەم کارە هەموو ڕۆژی خایاند • وردە لۆکەی وەك پەڕ هەموو دنیای

گرت و دەچوە ناو گوێ و لووت و چاوەوە • بۆ ئێـواره دۆشـەگەکان پڕکران و باش دووړران • کابرا بەپێی دەچوە سەر دۆشەگەکان بۆئـەوە کە لۆکەکە بە باشی بڵاوبێتەوە و بنیشێ و بتوانێ بە بـاشی بیـدوورێ • لەپاش ئەمە ژنان بەرگی ڕەنگاوڕەنگی سەرەوەیان تێ‌گرت و بەمە ئیشەکە تەواو بوو •

بۆ گەنجەکان خانووبێك لە ناوشار بەکرێ‌گیرا • مـن لەگەڵ زاوا و خوشکی گەورە بۆ تەواوکردنی کرێکە چووم • بەڵام بووکەکە لەگەڵمـان نەهات • چونکە بووك نابێ خانووی دوارۆژی خۆی پێشی گوێزانـەوە ببینێ • لە لایێکی‌ترەوە زاوا بۆ بووکەکە غەریب نەبوو ، هەردوکیان لـە کاتی فێرکردن یەکتریـان دیـبوو • کـە کوڕەکە حـەزی لـە کچـەکە کرد ژنێکی ماڵی خۆی نارد بۆ ماڵی کچەکە بۆئەوە کە داوای بکەن و مارەی بکا • هیچ پیاوێك لەناو موسوڵمانان ناتوانێ بۆ مـارەکردن راستـەوخۆ لەگەڵ کچێك قسە بکا • بۆ دەربڕینی هەستی خۆی بەرامبەر کچەکە بـە خوشکە گەورەکەی گوتبوو : « دەیەوێ لە ماڵی کچەکە قەبووڵ بکرێ » •

خوشکێکی بچووکتری بووك بە جۆرێکی جیاواز شوو دەکا • ئەمـە کچێکی زل و بەهێزی ١٢ ساڵە دەبێ و لە ماڵێکی‌ترەوە بو کوڕەکەیان داوا دەکرێ • دایك و باوکی کچەکە لەپێشدا پێی‌دەڵێن ئایا دەیەوێ شوو بکا و جیازی و خشڵی هەبێ • لێی نەپرسرا ئایا دەیەوێ شوو بە فلان کـوڕ بکا کە ببڕای نەیدیبوو • کچەکە باری ئافرەتی مارەکراوی لا باشتر بوو لە هی کچێنی لە ماڵی باوکی • ئەوەندەی پێ نەچوو مارەکردنەکە رێك‌خرا• تەنیا جارێك ئەم کچە مێردی دوارۆژی لەژێر پەچەی ڕەشـەوە دیـبوو • لەپاشان هەموو چوونە لای قازی بۆ تەواوکردن و تۆماری مارەیی • لەوێ لەلای قازی کچەکە ـ بێتو حەزی لێ نـەکردابێ ـ دەیتوانـی کوڕەکە قەبووڵ نەکا • چونکە هیچ کچێ بە زۆر بە شوو نادرێ • بەڵام مێردەکەی

دوارۆژی تەنیا جارێك لە سەربانەوە چاوی پێ کەوتبوو • ئەم دوو گەنجە ئەمە ٥ ــ ٦ ساڵە وەکو ژن و مێرد پێکەوەن و دوو منداڵی جوانکەلەیان هەیە کە هەردوك لە کچ دەکەن و جلی کچیان پۆشیوە • لەپاشان زانیم یەکێکیان کوڕە • بەڵام لەبەر هەرچی هۆیێك بێ وەك چاوەزار کوڕەکەش جلی کچی لەبەر دەکەن ، چونکە لێرە دایکەکان حەز لە منداڵی کوڕ زیاتر دەکەن و لە دڵی خۆیان دەڵێن کچ کەمتر تووشی چاوەزار (چاوێنی) دەبێ • هەردوو گەنجەکان ــ لەگەڵ ئەوەشدا مارەییەکەیان نەوەستابوە سەر هەستی دڵداری و جوانی لەش ــ باش پێکەوە دەژیان و بە بەشی خۆیان رازی بوون • هەردوکیان ژن و مێرد لە ماڵی خەزوور دەژیان و کچەکە بۆ سەردانی ماڵی باوکی ــ کە دوور نەبوو ــ دەبوایێ ئیزن لە خەسوو یان خەزوور وەرگرێ • زۆر جار ئەم کچە دەهاتە لای ئێمە • بەمە بۆمان دەردەکەوت بەئاسانی ئیزن دەدرا •

**بەکرێگرتنی خانوویێك بۆ بووك و زاوا**

ئەو خانوە کە دەمانویست بۆ بووك و زاوا بە کرێی بگرین لە ماڵەکەی ئێمەوە نزیك بوو • ئەو خانوەش وەك هی ئێمە بوو بەڵام تازەتر بوو • هەموو خانوەکە لە خشتی سوورکراوە دروست و زەویەکەی چمەتۆریژ کرابوو • بەڵام ئەو دوای دیوارەکانی و زەویەکەی بە قوڕ ماڵە درابوو • لە هەردوو خانوەکان سەربانەکان قوڕ بوو و وەستابوە سەر کۆلەکەی سپیدار •

خانوە بەکرێگیراوەکەی بووك و زاوا حەوشێك ، دوو ژوور ، پشت هەیوانێك ، ژوورێکی بچووکی بێ پەنجەرەی پشتەوەی تێدابوو کە بۆ دانانی شتی زیادە وەك گەنجینە بەکاردەهات • توژبنێك لە حەوشەکە بۆ چێشت لێنان لەسەر ئاگردان رێکخرابو • لە حەوشە حەوزێك هەبوو کە بۆڕی ئاوی لەسەر بوو • دوور لەناو حەوشەکە نزیك دیواری دراوسێ ژووری

تواڵێت هەبوو کە بۆڕی ئاوی تێدابو • لە ناوەڕاستی حەوشەکە دارێکی سەوز و خانوەکە چرای ئەلەتریکی هەبوو • خانوێکی سادە و هەرزان بیرای بیرای لەوە باشتر نەدەبو •

**ئامادەکردنی خانووی بووك و زاوا**

ڕۆژێ پێش گواستنەوە خزم و هاوڕێکانی بووك بۆ پاككردن و ڕێکخستنی خانوەکە چوون • بووك لەوێ نەبوو ، خەریك بوو لە گەرماوی ماڵەوە خۆی دەشۆری •

لە ماڵی بووك گەورەترین ژوور بۆ نووستن تەرخان کرا • هەموو تاخمەکەی بەغدا خرایە ئەم ژوورە ، ئەمانەش شتی گەورە بوون ، لەبەرئەوە لە ژوورەکە جێگای بەتاڵ نەما • دەسمانکردە ڕێکخستنی چەرپایەی بووك • دۆشەکە تازەکەمان لەسەر دۆشەکە سپرنگدارەکە دانا • بەمە نوێنەکە بەرز و کورت بوو • لەبەرئەوە دەربەست بووین (واتا مەجبوور بووین) لێفەکە لەلای خوارەوە دانێین تاکو کورتیەکە پڕکاتەوە • ئینجا سەردۆشەکمان خستە سەر بەجۆرێکیوا شۆڕ بێتە خوارەوە تاکو پەراوێزە جوانەکانی باش دەرکەوێ • ئینجا لێفەکەمان خستە سەر ، کە بەرێکی سپی وەك زەرفی قاقەزی پێوە دوورابوو • لە سەرەوە هەردو سەرینەکانمان دانا و هەموو نوینەکەمان بە سەرپۆشێکیتری جوان داپۆشی • ئینجا دەسمانکردە دامەزراندنی پەردەکان • لەپاش دامەزراندن کورت دەرچوون • بە پەلەپەل ناردمانە بازاڕ بۆ کڕینی چەند گەزێ ئەتلەس و دیسان بە پەلەپەل دووریمان • کە من تەقەڵم لێ دەدا عارەقە بە ناوچەوانم دەهاتە خوارەوە و ئەوەندە ماندوو بووم دەرزیەکە لە دەسم کاری نەدەکرد• سەنووقی جوانیمان دانا لەسەر مێزی تواڵێت • لەپاشان ژوورەکەیتریمان ڕێکخست و پڕمانکرد بە قەنەپە ، کورسی ، مێزی بچووکی جغارە و چای• گوڵی قاقەزی ژاپۆنمان لەبیرنەچوو • ئەمانە کە لە گوڵی ڕاستەقینە جوانتر و

بەگیانترن خرانە ناو گوڵدانی چینیەوە و لە ژووری نووستن و ژووری میوان دامانان •

لەوکاتە شتێکی تازە و سەیر ڕوویدا • باوك و دایکی زاوا هاتن و لە حەوشە دابەزین و لەوێش ئاگریان دەکردەوە و چێشتیان لێدەنا و شەوان لە سەربان دەنووستن • خانووەکە پڕ بوو لە منداڵان • بەڵێ هەندێکیان لەگەڵیان هاتبوون ، بەڵام هەندێکیتریش منداڵانی دراوسێ بوون • ئەمانە تەنیا لە حەوشە نەدەمان ، بەڵکو دەچوونە ناو هەموو ژوورەکانەوە • خوشکە گەورەی بەهێز و توانا وەکو وەکیلی بووکیش و هی زاوایش بێ چارەی ئەمەی دۆزیەوە • ئەو ژوورانە کە باش ڕێکخرابون کلیلیدان • کەسوکاری زاوا ئەمەیان پێ ناخۆش بو و نەختێ دڵگیر بوون • بەڵام چارەیان نەبوو • دەربەست بوون لە حەوشە و سەربان بژین و منداڵەکانیش لەوێ ڕاگرن •

کە هەموو شتێ تەواو بوو ئێمە لەبەر گەرما و پەستۆی ئیش و کار تەواو ماندوو و بێتاقەت بووین • خاوەنی خانووەکە دراوسێمان بوو • چووینە ماڵی و لەوێ بە خواردنی شووتی سارد بووژاینەوە و بە خواردنەوەی چای حەسانەوە •

ئێوارە حەوشەی ماڵەوە پڕ بوو لە ژنان • بووکەکە وەکو ترسابێ لە قوژبنێ خۆی ماتکردبوو • هێشتا جلە پەمەییەکەی شەوی لەبەربوو • ژنێکی نەختێ پیریش پەیدا بوو • ئەمە لەو ماڵە زۆر جار مامانی کردبوو • ئێستا هاتبوو بۆ ئەوە کە سبەی ئێوارە لەگەڵ بووکا بچێت و پەرۆی کچێنی لەگەڵ خۆیا بۆ ماڵەوە بهێنێ • گوتیان پاش دەمێك دەڕواتەوە بۆ جێگایێکی نزیك و بەیانی سەعات دە دێتەوە •

بەیانی ڕۆژی شایی دەسکرا بە ڕازاندنەوەی بووك • بەرگێکی

کوردیان کردە بەری کە لە قوماشێکی جوان لە سولەیمانی دروستکرابوو•
خوشکەکەشی دەموچاو و پرچی جوان کرد • کە جوان دەکرا بە شەرمەوە
لەسەر دۆشەگێك دانیشتبو و بە باوەشێنێك دەموچاوی لە خوشکەکانیتری
دەشاردەوە ، ئەو خوشکانە کە بۆ جل گۆرین بۆئەوێ هاتبوون • کە
ئامادەکردن تەواو بو بووکەکەیان بردە حەوشە تاکو لەوێ لەسەر کورسییێك
دانیشێ و بەخێرهاتنی ژنە مێوانەکان بکا • ئینجا خوشکە گەورە رووی کردە
من و بە مەعناوە تەماشاییێکی کردم •

## نووسەر خاتوو هێنی بەرگی کوردەواری دەپۆشێ

من لە زووەکەوە بەڵێنم دابوو لەو ڕۆژە بەرگی کوردی لەبەرکەم •
ئەمەش یەکەم و دوا جار بوو کە ئەمەم کرد • شەرواڵە درێژەکە زۆر گەرم
بوو بۆ یەکێك کە فێری لاق رووتی بێ • سوخمەکە کە لەسەر کراسە
درێژەکە لەبەرمکرد هەر لە سەرەتاوە بە عارەقە تەڕ بوو • سەرپێچی سەر
هەر باسی مەکە • من دەبوو ــ وەك ژنێکی بە شوو دراو ــ فێس و
پووشینی قورس بنێمە سەرم • من بەڵێنم بە سەرۆکی شارەوانی دابوو ــ
ئەو سەرۆکە کە زۆر کۆمەکی کردم ــ بە بەرگی کوردیەوە بچمە سەردانی•
ژنانی ماڵەکەم وایان بە باش نەزانی بۆ ئەم سەردانە کراسی سوورمەی
سووری لادێییانە لەبەرکەم• لەبەرئەوە وەك خاتوویێکی قۆزی سولەیمانی
کراسێکی تووڵی پەمەیی سورمەدارم لەبەرکرد • ئەمە ئەوەندە سفت
نەبوو و ژێرەوەی لێوە دیار بوو • من شەرمم پێوە دەکرد و هەستم دەکرد
تەنیا نیوەی لەشمی داپۆشیوە • بەڵام ئەم جۆرە کراسە دەستووری ناوماڵی
ئەودەمە بوو • من دەبوو لەسەر ئەم بەرگە زۆر جوانە عەبا بدەمە سەرما ،
عەباییێکی ئاوریشمی ڕەشی ئەستوور • من هەستم دەکرد قاپووتێکی درێژی
بێقۆلم لەبەرکردوە کە دەگاتە قاچم • لەپاشان بە پەچەییێکی رەشی سفت
رووم داپۆشی • جووتێ سۆلی سورمەداریان بۆ هێنام کە لە پێی کەم .

بەڵام من قەبووڵم نەکرد چونکە تۆ ناتوانی لە کۆڵانی خوارو خێچی قیرتاو نەکراودا لە پێی کەی • ئەو دەردە بەس بوو بە بەرگێکی شۆڕی درێژەوە بە ڕێگادا بڕۆم و لەژێر پەچەکەوە بتوانم هەر جارێ بە چاوێك بەرپێی خۆم بە ناخۆشی ببینم • یەکێ لە کچەکانی ماڵەکە ــ کە زۆر بـوون ــ ڕێگای پێشان‌دام تاکو لەناو ژمارەیێکی زۆر ئۆتۆمۆبیل ــ کە جێگاییێکی فراوانیان لە شەقامەکان گرتبوو ــ بتوانم بڕۆم • هەرچۆنێك بێ گەیشتمە ئەوێ و بە زیندوی گەڕامەوە •

کە گەڕامەوە ، ماڵەکە پڕ بوو لە ئافرەت کە وەك من بەرگی جوانیان پۆشیبوو کە دەدرەوشایەوە • ئەمانە شەربەتی مێوژیان پێدرا ، چونـکە شەراب لە ماڵە موسوڵمانەکان ناخورێتەوە • بێجگە لەوە چای و کولیچەشیان خرایـە بـەردەم •

**بووکەکە بەرگی سپی ئەورووپایی پۆشی**

من ئیتر لەوە زیاتر بەرگەی ئەو جلە قورسەم نەگرت و زوو گۆڕیم و بەرگێکی سووکی هاوینی ئەورووپاییم لەبەرکرد • بووکەکەش جلەکـەی گۆڕی • لە ژووری مێوان پەنجەرەکان پێوە دران و بەرگی سپی لەبەرکرا وەکو لە ئەورووپا بوە «بووکێکی سپی» : بەرگێکی بووکێنی سپیـان لەبەرکرد ، تاجێکی سپیان خستە سەری ، گوڵی قاقەز و خشڵی ناڕاستیان کردە ملی و بە پەچەییێکی سپی کە سفت نەبوو دەمو چاوی لێوە دەبیـنرا روویان داپۆشی • پێڵاوو گۆرەوی سپیان لە پێ کردو لە ژێرەوە شـتی سپی لەبەرکردبو • دەسکە گوڵی شاییش لە قاقەزی سپی دروست‌کرابوو •

پێیان گۆتم لە بەغدا و لە هەندێ ماڵان لە سولەیمانی بوە بە دەستوور بووك بە بەرگی ئەورووپایی دەبێ بچێت بۆ ماڵی زاوا • ئەم دەستـووره هەتا بچووکترین خاڵی لە ئەورووپا وەرگیرابو کە بووك بۆ کەنیسە دەبەن•

بەڵام لیرە لە بووك گواستنەوەی موسوڵمانان هیچ دەستوورێکی دینی نەبوو • ئەمەی ئێرە دەستوورێکی شارستانی تەواو بوو • بەڵام من لە دڵی خۆما دەمگوت چی دەکەن لەم بووکە کە لە سپیاییا دەدرەوشایەوە • لە سولەیمانی و بەغدا فێری رەوشتێکی تازە بوون ئەویش گەڕاندنی بووکە بە ریزێ قەمەرە کە هەتا دەمی بە ژن و منداڵ پڕی دەکەن و لە ماڵی بووکەوە هەتا ماڵی زاوا چەپڵەڕێزان دەکەن • چۆن ئێمە قوتووی چوکلێتی دیاری بە شریتی رەنگاوڕەنگ دەبەستین • هەروا قەمەرەی بووك بە شریتی رەنگاوڕەنگ دەرازێنرێ •

ئەو ژنانە هەموو مێوانی بووکن و باش خۆیان داپۆشیوە •

بەمجۆرە ئافرەتی کورد یەکەم جار و دوا جار لە ژیانی کە بەرگی سپی بووکێنی پۆشی دەتوانێ رووی خۆی لەژێر پەچەیێك پیشان‌دا کە سفت نیە و دیوەودەرە (واتا شەفافە) و چاوی غەریب دەتوانێ فەرقی پێ بکا و ببینێت • ئەمە نیشانەی گۆڕانە و وادیارە رۆژێك دێ لە عێراق پەچە هەڵدەگیرێ ، وەك لە زۆری وڵاتە موسولمانەکانی دنیا هەڵگیراوە [١] •

پیرێژنەکە لەپێش سەعات دە هاتەوە • بووك و زاوا بۆ شەوی یەکەم چوونە ژوورە بچووکەکەی پشتەوە • کەسوکاری زاوا لە حەوشە و سەربان بوون و بووبوونە تەگەرە بۆئەوە کە لە ژووری بووك بە رەحەتی و دوور لە چاوی خەڵك بتوانن لەگەڵ یەکتری بن •

پیرێژنەکە لە دەرەوە دانیشتبوو و چاوەڕێی تەواو بوونی کاری زاوای

---

(١) هەروەکو لە پەراوێزیکی‌تردا گوتم ئێستا لە شاری سولەیمانی ژنان بەدەگمەن روویان بە پەچە دادەپۆشن . ئێستا تەنیا ژنە سوالکەرەکان بۆئەوە کە نەناسرێن و بە رەحەتی و بێ‌شەرمانە دەرۆزە بکەن دەموچاویان باش بە پەچەیێکی زۆر سفت دادەپۆشن .

**وەرگێر**

دەکرد • ئەو بەخۆرایی چاوەڕێی نەدەکرد • من پرسیم بێتو بووکەکە کچ دەرنەچێ ئایا دەکوژرێ ؟ لەم کارە من سەرم سووڕمابوو : چۆن ئەم دەستوورە کۆنە ڕێك دەکەوێ لەگەڵ تاخمی قەنەپە و کورسی ئەورووپایی و بەرگی بووکێنی سپی کە ڕاستەوخۆ لە ئەورووپا وەرگیراوە • لە وەڵامدا گوتیان : نەخێر ناکوژرێ ، لەپێشدا بۆ لای دکتۆر دەنێررێ ، چونکە خوا هەموو کچانی وەك یەك دروست نەکردوە •

من بیرم کردەوە لەو کچانە کە بێ‌گوناح هەتا ساڵانی کۆن کوژران و دلم پێیان سووتا • بەڵام کە زاوا کەوتە گومانەوە و پیاوێکی چاك بوو لەوانەیە مریشکێك سەربڕێ و خوێنەکەی بخاتە سەر پەڕۆکە و بەمە ئابڕووی کچێك بپارێزێ و شوورەییەکەی داپۆشێ •



وێنەیێکی دەسکردی پێشخانێك لە تۆیزاوە

– ٣ –

# بەرگو پۆشەگی کورد

لە عێراق بەرگێکی تەواوی ئافرەتی کوردم هەبوو کە بۆ من کرابوو. ئێستا لە رۆژێکی تشرینی دووەمی دێنمارك کەوا لە بەردەمم کەوتوە لــە جێی خۆی نیە . وەك بیبی مەتوبێك وایە کە کەشتیەوانەکان بۆیان دەهێناین هەموو ژیانی خۆی لەناو قەفەسێکی بەرز لە ژووری دانیشتن رادەبوارد .

وا ئێستا تەماشای رەنگەکان دەکەم : پــیرۆزەیی (واتــا شینێــکی سەوزکار ) ، سووری کاڵ ، سووری تێر ، مۆر و ئــاڵ . ئــەم رەنگانــە پێکەوە ناگونجێن و لە بەرگێك لەگەڵ یەك رێك ناکەون . تەماشاییێکی وێنە ڕەنگاو ڕەنگەکەشم کرد کە لەوێ وەرگیرابوو ئەمەی پێشاندا . ئێستــا کە تەماشای پارچە بەرگەکان دەکەم دەبینم لەو بارەی لە سولەیمانی چاوم پێ کەوتبوو درشتتر و نەگونجاوتر دیارن .

لێرە دەمەوێ بڵێم ڕۆشنایی لەسەر ڕەنگ زۆر کار دەکا • چۆن هەوای وشك لە عێراق هەموو نمو تەڕی لە لەش لادەبرد و مرۆڤ لەگەڵ ئەو هەموو خۆراکە لاواز دەبوو ، هەر بەمجۆرە ڕۆشنایی بەتین تیژی ڕەنگەکان دەسووتێنێ و باشتر پێشانیان دەدا •

ڕۆشنایی تیژ و شەوقی ڕۆژ کە هەموو دیمەنی سەر زەمین لە عێراق سپی دەکات ، مرۆڤ دەربەست دەکا ئەم چەشنە ڕەنگانە هەڵبژێرێ • بیبی مەتۆیش لە جێگای خۆی ئێسکێکی (وانا شکڵێکی) ڕەنگاوڕەنگی جوانی هەیە • بەڵام دەبێ بزانین ڕەنگ نابێ نەلای ئێمە لە باشووری ئەورووپا زۆر بێ • چونکە لەژێر ڕۆشنایی نەرمی لای ئێمە هەموو ڕەنگێکی کاڵ بە جوانی دەردەکەوێ و لەگەڵ یەك دەگونجێ •

من خۆم لە خۆمەوە ئەم چەشنە ڕەنگانەم هەڵنەدەبژارد • من جارێکیان بە تەنیا چوومە ناو کۆڵانە تەسکەکانی قەیسەریە نزمەکەی سولەیمانی کە ئەمبەرو ئەوبەر لەبەر چرای تیژ قوماشەکانیان هەڵواسیبو و پێشاندابوو• یەکێ لە دووکانەکان تەنیا دوو پێ لە زەویەوە بەرز بوو • لەوێ لە ناوەڕاست کووتاڵ و قوماشەکان خاوەن دووکان دانیشتبوو • چراکانی دووکانەکە ئەوەندە تیژ بوو چاوی دەکولاندەوە • تۆ لەوێ دادەنیشتی و دەستتدەکرد بە کڕین • لە بەرامبەرت دووکانی بەرگدوورێك هەبوو کە خەریکی دوورینی جلی ڕەنگاوڕەنگ بوو • لەملا و ئەولای ئەم دووکانە دووکانی بەرگی حازر هەبوو ، کە جلە حازریە جوانەکانیان هەڵواسیبوو • کە تەماشای ئەم بازارەم دەکرد و لێی ورد دەبوومەوە ، هەرچی ئافرەت حەزی لێ بکا لەوێ بوو • بەڵێ شت کڕین لێرە بە بێگومان خۆشە • کە لە دووکانێك ــ وەك ئافرەتێکی غەریبی بیانی ــ دادەنیشتی خەڵکی تەماشاکەری فزوولی ــ کە هیچ پەیوەندییان بە تۆوە نیە ــ هەر تەنیا بۆ تەماشاکردن لەسەرت کۆدەبونەوە • منداڵانی ٨ هەتا ١٠ساڵان ــ کە لەو

تەمەنە منداڵیەوە دەسیان کردوەتە ئیش کردن و نان پەیدا کردن ــ دەورەی تۆڕیان دەدا و دەسیان درێژ دەکرد و شەڕیان دەکرد تاکو بە زۆر شتەکانـت بـۆ هەڵگرن •

بە ڕاستی من نەمتوانی کوتاڵەکان بکڕم و وازم لەوە هێنا خۆم بـە تەنیا شتیوا بکەم •هەتا ئەو دەمە من لە دنیەکەم مانگێکم پێچووبـوو و ژنانی ماڵەوەم لەوێ بە بەرگی تازەی ڕەنگاو ڕەنگەوە دەبینی • ئەودەمـە زانیم ڕەنگە سەرەکەکانی قوماشی ژنان سوور ، ئاڵ و پیرۆزەیی‌یە • لـە دووکانەکە چاوم بەو ڕەنگانە و ئەو چەشنە قوماشـانە کەوت • ئەودەمـە فێربووبووم کە ئافرەتان دەیانکڕن و لەبەریان‌دەکرد • لە دووکانەکە کـە خەریك بووم قوماش بکڕم هەموو شتێکی ئافرەتان هەبوو تەنانەت فێس و سەرپـۆشی سـەر •

من بیرم کردەوە و زانیم من کە لە ئەورووپا گەورە بووم و فـێری ڕەنگ و نەخشەکانی ئەورووپام بیرای بیرای ناتوانم لێرە قوماش بکڕم• من ترسابووم لەوە کە قوماشێکیوا بکڕم بە دلم بێ ، بەلام بە دلی ژنانی ئێرە نەبێ • لەبەرئەوە بڕیارم‌دا لەگەل تەرجومانەکەم بۆ قوماش‌کڕین بچینـە بازاڕ • بۆ ناو بازاڕ چوون و شت‌کڕین لەگەل تەرجومانەکەم زۆر خـۆش بوو • بەلام لە ڕێگا کە پێکەوە قسەمان دەکرد ، ئەوەندەی نەمابوو لەگەل یەکتری ڕێك نەکەوین • ئەو دەیویست قوماشی وابکڕین کە بۆ بـەرگی ئافرەتانی سولەیمانی دەس‌بدا • بەلام من قوماشیوام دەویست کە ژنـە لادێییەکان دەیکڕن و بە بەرگ لەبەری‌دەکەن • تەرجومانەکەم سەرێـکی هێنا و سەرێکی برد ، لەسەر کەللەڕەقی من هەناسەیێکی هەلکێشا و هاتە سەر قسەی من • ئینجا منی بردە دووکانێك لە قەیسەری کە ژنە لادێییەکان قوماشی لێ دەکڕن ، نەك دووکانە تازەکان کە قوماشی مۆدەی نایلـۆنی ژاپۆنی لێ بەدەست‌دەکەوێ •

ئێمە پێکەوە چووینە قەیسەری و لەوێ هاورێکەم بە ئازایی و بە بێ دوودلی دەسی کردە هەلبژاردنی قوماشەکان. بە خوا بهاتایە من هەلم بژاردایێ بەپێچەوانەی ئەو رەنگەکانم هەلدەبژارد . چونکە من فێری رەنگەکانی ئەورووپام . بەلێ ئەو عەبای لەبەرکردبو و پەچەی پێوە بوو بەلام قوماشەکانی باش دەناسی و باش هەلدەبژارد . لەو دەمە کە ئێمە شتمان دەکڕی دوو ئافرەتی دێیەکەمانیش بۆ شتکڕین هاتبوون و سەلامیان لێ کردین . بەڕاستی من نەمناسین چونکە لە دوو خێوی ڕەشیان دەکرد . بەلێ ئەمانە لە لادێ بە بێ عەبا و پەچە دەگەڕێن . بەلام کە دێنە سولەیمانی دەبێ لەسەر دەستووری ئێرە بڕۆن ، خۆیان بە پەچە و عەبا داپۆشن ، واتا خۆیان دەگۆڕن و وەك خێوێکی ڕەش خۆیان پیشان دەدەن .

من ئێستاش تێ نەگەیشتم چۆن ژنێك لەژێر عەبا و پەچە ئەوانی تری دەناسێ کە لە سولەیمانی بە هەلکەوت پێیان دەگا . هەندێ جار ئێواران لەگەل چەند ژن دەچووینە سینەما . کە دەردەچووینە دەرەوە لە ناوەڕاستی قرمقڕ و هاژەی خەلك من هاورێکانی خۆم کە خۆیان کردبوە خێوی ڕەش لە تاریکایی بزر دەکرد .

ژنێك بەم ڕەشپۆشیەوە چەندی خۆی دەشارێتەوە ، چەندی بزر بوو و نەناسراو دەبێ !! بەلێ ئەو لەژێر پەچەکەیەوە خەلکی دەبینێ ، بەلام کەس ئەو نابینێ . ئەو ژنە نەناسراوە ، پێت ناکرێ بیناسی و نابینرێ . تۆ کە لێیان ورد دەبیتەوە وادەزانی لەوە نەناسراوترن کە دەم بەستراو بن . من هێشتا تێ ناگەم چۆن پیاوەکان رازین لەگەل یەکێك قسە بکەن کە خۆی لە خەلك گۆڕیبێ . من لەگەل تەرجومانەکەم چووینە چەند دایەرەیێك کە پیاوان بە ڕوو دانەپۆشراوی ــ وەك من ــ دانیشتبوون و دەمتوانی لەباری قسەکردنیان لەگەل تەرجومانەکەم وردبمەوە ، ئەو ئافرەتە کە لە ژێر جلە رەشەکەوە خۆی شاردبوەوە . زۆر پێ کەنینم دەهات بەوە کە چۆن شووشەی

کۆلاکەی لەژێر پەچەکەوە دەخواردەوە • لەم ولاتە گەرمانە هەموو دەمێ خواردنەوەیێك بە مێوان دەدرێ : چای گەرم یان پیپسی کۆلای سارد کە جێگای خواردنەوەی ئێمەی گرتوە لە ولاتی موسولمانان • خواردنەوەی سەرخۆشکەر تەنانەت بیرەش لەم ولاتانە حەرامە • ئێمە چەند جارێ چووینە دایەرەیێك و کاربەدەستەکە بە دەنگ کچەکەی ناسی ، بەلام بڕای بڕای چاوی بە ڕووی نەکەوت و لەبەرئەوە کە خزمی نەبوو نەیدەتوانی چاوی بە ڕووی بکەوێ • لای من وایە ژنێك کە بتوانێ هەموو شتێ ببینێ ، بەلام خۆی نەبینراو بێ باشتر دەتوانێ بگاتە مەبەستی خۆی و ئەمە هەندێجار پیاوان دەخاتە ناخۆشیەوە ، ئەو پیاوانە کە مێشکیان کولدەکەن بەوە تاکو بزانن ئەمە کێیە ؟ لێرە وایان تێگەیاندم پیاوان ، بۆئەوە کە پیاوانی‌تر چاویان بە ژنەکانیان نەکەوێ ، پەچەیان داهێناوە• بەلام من بڕوام وایە لەم دەستوورە پیاوان لە ژنان زیاتر تووشی ناخۆشی ، دەردەسەری و نەخۆشیی دەمار بوون •

جارێکیان تەرجومانەکەم کە تەواو بە پەچە و عەبا خۆی داپۆشیبوو توانی بەسەر کۆمەلێك لە پیاوانی زەلام زەلام زالّ بێ کە لە دەوروپشتی پاسێك راوەستابوون • ئێوارەیێکی زوو بوو و من دەمویست بۆ سەر کاری بەستێنی دووکان بچم • بەلام پاسەکە پڕ بوو و نەیدەویست هەتا سەر بەستێنەکە بڕوا • کێشەی (واتا مشکلەی) یەکەم ئەوەبوو لە پێشەوەی پاسەکە جێگایێك بدۆزمەوە ، دووەم ئەوەبوو من بگەیێنێتە جێ • تەرجومانەکەم وەك پلنگ چوە گیان بڕانەکە [1] (واتا سائقەکە) ، لەپاشان خاوەن پاسەکە و رێبوارەکان • ئینجا کەوتە گیان ئەو تەماشاکەرە فزوولیانە کە لێرە هەندێجار بە بێ‌مەبەست ، هەر بۆ تەماشاکردن و فزوولی

---

(١) بڕان Biran لێرە (ی)بەکە زۆر کورتە وەك بزان ، بلّێ ، بکوژ ، ببڕ •

کۆدەبنەوە • من حەزمدەکرد لە قسەکانی هاوبەش بم ، چونکە هەراکە لەبابەت گەڕانی منەوە بوو • بەڵام داخەکەم من کوردیەکەم ئەوەندە باش نەبوو وشەکانم تەواو نەبوو بۆ ئەم بابەتە قسانە • تەرجومانەکەم بە بڕانەکەی گوت لەپێشەوە کەسیتری سوار نەکا و هەردوو جێگاکەی پێشەوەی بۆ من دابنرێ بۆئەوە کە من بە ڕەحەتی بگەمە جێ • ئەو کابرایە کە دەیویست لەپێشەوە سوار بێ دابەزی و لەتەنیشت بڕانەکە خۆی بە پاسەکەدا هەڵواسی • من بە بەشی خۆم رازی بووم و حەزم نەدەکرد کابرایێکی ڕێبوار لەبەر من خۆی بخاتە تالووکەوە • بەڵام ئەو بە قسەی منی نەکرد و بە بڕانەکەی گوت بە قسەی من نەکا ، لەپاشا نومرەی پاسەکە وەردەگرێ و ئەیدا بە کاربەدەستی هاتوچۆ و لەوانەیە تووشی سزا ببێ • کاکی بڕان منی بەتەنیا گەیاندە جێگاکەم • بەڵێ من تێدەگەم ژنێکی جوان بەهۆی چاوە جوانەکانی بتوانێ بەسەر چەند پیاوێکا زاڵ بێ ، بەڵام ئافرەتێك لەژێر پەچەوە هەر بەهۆی گرەی دەنگ و قسە و چاوەڕاو ( واتا هەرەشە)وە بەسەر پیاوانا زاڵ بێ ئەمە شتێکە کەم کەس دەتوانێ بیکا • لێرە دەستوور نەك تەنیا بەهۆی پەچە و عەباوە ، بەڵکو بەهۆی زۆر شتیترەوە سنووری ژیانی ئافرەتانی تەسك کردوە • بەڵام ژنان هەمووەدەمێ لەم ماوە تەسکەی خۆیان سوودیان وەرگرتوە • بەڵێ هەندێ جار ژنێکی ئەورووپایی وادەزانێ ژیان لەژێر ئەم جۆرە دەستوورە و لەناو ئەم ماوە تەسکە زۆر ناخۆشە و لە دڵی خۆیا دەڵێ نازانم ئەم ژنانە چۆن بەرگەی دەگرن ! بەڵام کە چووینە ناویان و لەگەڵیان ژیای ئەوکاتە تێدەگەی ژنی ئەورووپایی ، کە بە ئازادیەکەی خۆی دەنازێ ، لەوان باشتر ناژی • لە ڕۆژئاوا ئەمە پەنجا ساڵە ئێمە خەریکی ئازادکردنی ئافرەتانین کە وەك پیاوان هەمان مافیان بدەینێ • لەپاش چەند مانگ ژیان لەناو ژنانی موسوڵمانان ــ کە لای ئێمە بە چەوساوە و بەندیکراو دەژمێررێن ــ گەیشتمە ئەو بیرە کە بڵێم : « بێتو من پیاو بم رقم هەڵدەسێ

لەناو ئەم جۆرە کۆمەڵەدا لە شاران بژیم • چونکە ژنان باش سوودیان لە دەستوورەکە وەرگرتوە و پیاوان تووشی زیان بوون » • لە دێهاتی ئێرە ــ خواو ڕاستان ــ ئافرەتان سەربەستترن •

**دانیشتنێکی ژنانی سولەیمانی**

لە ماڵی خۆمان لە سولەیمانی ئێوارەیێك دانیشتنی ژنان کرا • لەبەر گەرمای ئێوارە قەنەپە و کورسیە ناخۆش و ناشیرینەکان لەگەڵ تەپڵەکی جغارە و چای بۆ حەوشە گوێزرانەوە • دۆشەگیش لە تەنیشت دیوارێك بۆ ئەوکەسانە ریزکرا کە دەیانەوێ لەسەر زەوی دانیشن • بڕیاریواش درا من لەسەر یەکێ لەو قەنەپە بەرزە نارەحەتانە بەدرێژی ئەو ئێوارەیە دانیشم •

چوار کۆمەڵی ژنان بۆ ئەم دانیشتنە هاتن • کۆمەڵی یەکەم کە تەرجومانەکەم و منی تێدابوو بەرگی ئەورووپاییمان پۆشیبوو • لەم کۆمەڵە کچەکانیتری ماڵەکەش هەبوون کە بەرگی فێرگە (واتا مەکتەبیان) پۆشیبوو • کۆمەڵێکی بچووکی ژنان کراسی درێژی سووری شەویان پۆشیبوو • ئەمانە خشڵیان لە خۆ نەدابوو ، پەچەیان نەبوو و کە چوونەوە بۆ دوعاخوازی بە ئینگلیزی دەیانگوت « بای بای » • ئەمانە هەستی ئەوەیان دەکرد زۆر لەسەر مۆدەی ئەورووپان • ئافرەتە کۆنەپەرستەکان کۆمەڵی سێیەم بوون کە بەرگی رەنگاو رەنگیان لەبەرکردبوو و وەك ئافرەتەکانی لادێیەکەی خۆم خشڵێکی زۆریان لە خۆیان دابوو • زۆربەی ئەم ژنانە منداڵی زۆریان لەگەڵ خۆیان هێنابوو • کەواکانیان شین و سەوز بوون ، سوخمەکانیان لە سورمەی ڕەنگی تێر ، فێسەکانیان خشڵدار و سوور و رەش بوو • لەپشتەوە شاڵی سوور و سەوزیان خستبوە سەر شانیان هەردو دایکی ماڵەکە لەم کۆمەڵە بوون • ئەم ژنانە لەسەر دۆشەگەکەی

سەرزەوی دانیشتبوون و جغارەی درێژی کوردییان دەکێشا • جـۆری دانیشتنیان زۆر پلاستیك بوو ، دەیانتوانی هەم بە چوارمەشقی ، هەمیش بە ئەژنۆ بەرزی دانیشن • من هەندێ جار دەمویست لاسایی‌یان بـکەم و وەك ئەوان دانیشم • بەلام داخەکەم پێم‌نەدەکرا • ئێمە ئەورووپاییەکان لـە هەموو شـوێنێ جێگای دانیشتنی باشمان هەیە • ئایـا دانیشـین یـان بڕۆین لاقەکانمان تەنیا بۆ پاشەوە یان بۆپێشەوە دەجولێنین • بەلام خەلکی رۆژهەلات کە دانیشتن دەتوانن جمگەی رانیان و ئەژنۆیان بۆ هەمولایێ بجوولێنن و رابکێشن • کە بە چوارمەشقی دادەنیشن لاقەکانیان دەخەنـە ژێریان و بەشی سەرەوەی لەشیان راست دەخەنە سەری • ئەمە دانیشتنێکی زۆر جوانە • ئافرەتی رۆژهەلات بەم‌جۆرە دەتوانێ بەتەواوەتی بحەسێتەوە، بۆ چەند لا خۆی بگۆڕێ و دانیشێ •

ئێمە ئەورووپاییەکان جۆرە جوانی‌یێکی بزێومان هەیە • ئێمە دەبێ لە بزووتن ببینرێین • لەبەرئەوە کە دانیشتین و راکشاین ناحەسێینەوە • ئێمە وەك تراکتۆرێك واین کە بە راوەستاویش دەلەرێتەوە • لەبەرئەوە من بـە خۆشیەوە تەماشای ئافرەتەکانی رۆژهەلاتم دەکرد کە چۆن خۆیان بە باشی دەحەساندەوە •

بێجگە لەم سێ کۆمەلە ژنـانەی سەرەوە کۆمەلێکی چوارەم هەبـوو بریتی بوو لە ئافرەتەکانی سولەیمانی کە بەرگی مۆدەیـان لەبەربـوو • پۆشەکی (واتا بەرگی) ئەم ئافرەتانە لە هی لادێییەکانی دەکرد ، بەلام نەختێ گۆڕرابوو • کراسە دیوەودەر (واتە شەفاف)ەکانیان لە قومـاشی نایلۆنی گولداری ژاپۆنی یان توولی سورمەدار دروسـت کرابوو • رەنـگەکان درشت و زەق نەبوون ، بەلکو نەرم بوون • ئەم کراسانە دەگەیشتە سـەر ئەژنۆ و بەشی سەرەوەی لەشی دادەپۆشی • پشتوێنێکی تەسك ناوقەدیانی باش دەبەست • ئەم پشتوێنە لەلای هەندێ ئافرەت بە پارچە لیرە رازابووەوە،

ژنە لادێییەکان پشتوێنیان نیە • کەواکانیان و کراسەکانیان ڕاست هەتا خوارەوە درێژ دەبێتەوە و هەندێ جار لەباتی پشتوێن بە پارچە قوماشێک ناوەڕاستی خۆیان دەبەستن • کچێك کە هێشتا شووی نەکردبێ پەچەی سەری نیە • ژنانی ماڵ کە شوویان کردوە فێس لەسەریان ناڕێن و پێچەی زل ناپێچن بە سەریانەوە • لەپاشان ئافرەتانی ئەم کۆمەڵە سەر ڕووتبوون و قژیان کورت بڕیبوو و وەکو هەندێ کچە بیست ساڵەکانی ئەورووپا پرچی خۆیان کوڵ کردبوو •

ئەرێ ئەم هەموو زێڕەیان لەکوێ بوو ؟ هەندێکی بەشێك لە مارەیی بوو کە بە لیرەی زەرد خرابوە سەر فێس و سەرپێچ کە ئافرەتە کۆنەپەرستەکان لەسەریان نابوو • ئافرەتەکانی سولەیمانی زێڕەکانیان بە ملوانکە ، پشتوێن یان بازنگ لە خۆیان دابوو • ژنێك بایی ۸۰۰ دینار زێڕی لە خۆی دابوو ، یەکێ لە ئافرەتەکانی سولەیمانی پەراوێزی سوخمەکەی بە لیرە و پارچە زێڕی‌تری ڕازاندبوو •

ئافرەتەکانی ناوشار لەسەر زەوی دانەنیشتن ، بەڵکو لەسەر قەنەپە و کورسی • ئەوەی سەرنجی منی ڕاکێشا ئەوەبوو ئەو ئافرەتانە کە بەرگی نایلۆن ، ئەوانە کە کراسی درێژ و ئەوانی‌تری کە جلی ئەورووپایی‌یان لەبەرکردبوو ، ئەمانە هەموو لەسەر قەنەپەکانیش زۆر جار بە چوارمەشقی دادەنیشتن • وادیاربوو جمگەی ڕانیان وا نەرم بوو و وا فێربووبوون لەسەر زەوی زۆرتر بەو چەشنە دانیشن •

کەس لەم ئافرەتانە خووی نەگرتبوو بەوە کە پێڵاوەکانی دانەکەنێ • لەم وڵاتانە کە مرۆڤ هەمیشە لەپێش ئەوە لەسەر دۆشەگ یان فەرش دانیشێ پێڵاوەکانی دادەکەنێ ، پێڵاو بە پارچەیێك بەرگ دادەنرێ • لە هەموو ماڵەکان کە دەچووم تەماشام دەکرد لایێك پڕە لە پێڵاو کە بێ‌خاوەن و بە تێکەڵاوی فڕێدراون • لە ماڵەکەی سولەیمانیم هەر ئافرەتێ

دەیتوانی پێڵاوی یەکێتری لە پێ کا • زۆر جار ژنانی کورد بە پێپەتی لەماڵەوە دەگەڕێن ، ئەمەش شتێکی سەیر و سەمەرە نیە و جوانە [1] •
بەڵام ئەوەی پێم لا سەیر و چەوت بوو کچێکم دەدی بەرگی ئەورووپایی کورتی لەبەرە و پێپەتیە •

دانیشتنی ژنەکان لە حەوشەکە درێژەی کێشا هەتا ئێوارەیێکی درەنگ و گەیشتنە شەو ، لەژێر هەستێرەکان پێکەوە رایاندەبوارد و دەمەتەقێیان دەکرد • لەبەر گەرمی ئاو و هەوا پەیتا پەیتا ساردەمەنییان دەخوارد و بەفراویان دەخواردەوە • بەفر لە چاڵە بەفر پایزان دەپارێزرا و هاوینان بە بار بۆ شار دەهێنرا و لە بازاڕ دەفرۆشرا • ئەم بەفرە نەختێك لە پووشەکەی پاك دەکرا و دەخرایە ناو ئاوی خواردنەوە ، ماستاو یان شەربەتەوە • هەموویان لە هەمان کاسە ئاویان دەخواردەوە و بۆ هەر یەکێ ئاوی تازە تێدەکرا • لەپاش ئەمە چای هات و جارجاریش خەریکی قرتاندنی ناوکی وشکی سوێر بوون وەك ناوکە کوولەکە ، ناوکەشووتی و ، تۆی گوڵەبەڕۆژە • لەپاشان مێوەیان بۆ هێناین • لە سەرەتای هاوین ترۆزی و ئارو (واتا هێروێ ، خەیار) بە پارچەی درێژ درێژ کە خوێی بەسەرا دەکرا ، لەپاشان کاڵەك و شووتی •

یەکێ لە ئافرەتەکان پاش ماوەیێك هەڵسا و چوە سەر حەوزی ئاو ، لەوێ دەسنوێژی سەند و چوە لای عەباکان و لەژێرەوە بەرماڵێکی خوری دۆزیەوە و دایخست و لەسەری نوێژی کرد • وا دیار بوو لە ماڵەوە نوێژی ئێوارەی نەکردبوو • لە دواییدا منداڵانی مێوانەکان و ماڵەوە کەوتنە

---

(1) لە ئەمەریکا زۆر جار ژنی خانەخوێم دەدی لە ماڵەوە بە پێپەتی ئیش دەکا • ئەو ژنە پێی گوتم لە ولاتی نەرویجیش ـ کە لە باکووری ئەورووپایە ـ ژنان لە ماڵەوە پێپەتین و بەمجۆرە پێیان دەحەسێتەوە •
وەرگێڕ

وەنەوزدان و لە جێگای خۆیان خەویان لێ کەوت. نەخۆشێکی هەڵامەتدار کە لە ژوورەوە دەحەسایەوە هاتە حەوشە . ئەمە کچێکی هەراشی یەکێ لە مێوانەکان بوو . لێرە منداڵە نەخۆشەکە ــ لەگەڵ ئەوەشدا وا دیار بــوو تای لێ هاتبوو ــ لە ماڵەوە بەتەنیا بەجێ نەهێڵرابوو ، چونکە ئەمە لێرە عەیبە. ناوچەوانی باش پێچرابوو . ئەمە لەبەرئــەوە بوو ــ وەکو گوتیــان ــ سەرئێشەکەی کەم بێتەوە . لە زۆر جێگا ئەم چەشنە پێچانی ناوچەوانــەم بۆ گەورە و بچووك دەدی . ئەم کچە لەسەر قەنەپــەکە لە تەنیشتمــەوە دانیشت . لەوکاتە شووتی بە مێوانەکان دەدرا . من ــ لە ترسی ئەوە نــەك نەخۆشیەکە وەرگرم ــ لە یەکەم ماوە کە بەدەستم کەوت جێگاکەم گۆڕی . من لە سەرەتای مانەوەم لە شار تووشی نەخۆشی‌یێــکی ورگ بــووم و پزیشکێکی (واتا دختۆرێکی) عێراقی دەرمانی بۆ نووسیم . گەرمی لەشم بەرز بوو و لە ژووری مێوانانی ماڵەکەم چەنــد رۆژێ کەوتــم و هەمــوو ژوورەکەم بۆ خۆم داگیر کرد . لەبەرئەوە حــەزم نەدەکرد جارێــکی‌تری نەخۆش‌کەوم . لەو رۆژانە ئنفلوانزە Influenza بڵاو بووبوو و لە ماڵەکەم ٤ ــ ٥ کەس تووشی بووبوون و لەوانەبوو پزیشك بانگ‌کرێ. بەڵام سەرۆکی خێزان فەرمانی‌دا نابێ پزیشك بۆماڵەوە بانگ‌کرێ و کەس لە نەخۆشەکان بە سواری عارەبانە نابێ ببرێتە سەر دختۆر ، چونکە لــەو رۆژانە یەکێ لە منداڵە بچووکەکان لەگەڵ ئەوەشدا دختۆر دەرزی لێ‌دابوو مرد ، لەبەرئەوە کاکی ئاغای ماڵ بڕوای بە دختۆر هاتبوە خوارەوە .

## ژنێکی جوانکەلەی دەنگ‌خۆش

لەناو ژنەکان یەکێك تەواو سەرنجی راکێشا . ئەم ئافرەتــە زل و جوانکەلە بوو ، وەك هەستێرەی Opera « واتا گۆرانــی و شانۆگەری» دەنگێکی بەرز و خۆشی هەبوو . کە پرسیم پێیان گوتــم گۆرانی‌بێژێکی باشە . زۆر قسەی پێ‌ناوێ بڵێم لێــرە کە زۆرتر غــەمی

پەروەردە کردنی کوڕان دەکرێ ، فێرگەی « واتا مەکتەبی » وا نیە بـۆ مەشقی گۆرانی [1] • ئەمە بووك بوو تازە شووی کردبوو و منداڵێـکی بووبوو ، بەڵام شووەکەی باش نەدەڕۆیی و خەڵکێش رەخنەیان لێ دەگرت• من بیرم لەوە دەکردەوە بێتو ئەم کچە لە ئەورووپا بوایێ بەم دەنگ و جوانیە وەك هەستێرەیێکی گۆرانی دەگەشایەوە • لێرە تەنیا ژنان بە بـەرزی و خۆشی و شانازی باسی جوانیان دەکرد • بەڵام منداڵبوونی یەك لەدوای یەك ، ئەم کۆمەڵە بچووکە کە دەورەیانداوە و تەنگیان پێ هەڵچنیـوە ، دەبنە هۆی ئەوە ئەم گوڵە جوانە سیس بێ و هەڵوەرێ • ئێمە بـا زۆر رەخنەش لەم ڤاوە نەگرین • لە رۆژئاوای بۆسفۆرِ لـە ئەورووپـاش زۆر کۆمار و کۆمەڵیوا هەن کە ئافرەتی زۆر جوانی تیا هەڵدەکەوێ ، کە ــ بـە بێ ئەوە کە خەڵکێکی زۆر سوودیان لێ وەرگرن ــ دەژین و دەمرن •

دانیشتنەکە هەر درێژەی کێشا و ژنانیش هەر خەریکی دەمەتەقـێ بوون و ماوەی ئەوەیان هەبوو باسی زۆر شت بکەن • قسەی پێ نـاوێ بڵێم ئەم ژنانە هەموو شتێکیان دەزانی کە شایانی زانین بێ • ئەوەی شایانی باس و روونکردنەوەیە ئەم ژنانە کە لە ماڵەوە دەمێنن و تەنیـا خەریـکی ئیشوکاری ماڵ و منداڵی خۆیانن و کاتی خۆیان بە فیڕۆ نادەن لـە ژنـە سەربەخۆکانی وەك ئێمە تەواو زۆرزاناترن ، ئەو ژنانەی ئەورووپا کە هەموو کاتی خۆیان تەرخانی ئیشە تەسکەکەیان دەکەن و لەوە زیاتر هیچ نازانن •

بە هەمان بیر دەتوانین قسەی داپیرە گەورەکانمان قەبووڵ کەین کـە جاران دەیانگوت : «ئەوەی بێشکە رادەژەنێ دەتوانێ دنیاش بجووڵێنێ» •

---

(١) ئێستا حوکوومەتی عیراق خەریکی پەروەردەکردنی کچانیشـە لەگـەڵ کوڕان و فێرگەی گۆرانی و مۆزیقەیوا هەیـە کە کـوڕو کچی تێـدا دەخوێنن .

وەرگـێڕ

ئێمە ژنانی ئەورووپا ئێستا بەدەگمەن بێشکی منداڵ ڕادەژێنین و ئەوەندە خۆمان لە ئیش و کاری تایبەتی خۆمان نوقمکردوە کە ئاگامان لە دنیا نیە و نازانین تەختەی وشك لە داری سەوز هاتوە •

## هاتنەوەی پیاوان بۆ ماڵەوە

نزیك سەعات یانزەی ئێوارە ـ سەعاتێ پێش نیوەشەو ـ پیاوان ، باوك و کوڕ هاتنەوە • هاتنەوەی مێرد و کوڕ لەلای ئێمە لە ساڵەکانی دوای ۱۹۲۰ دەبوە هۆی بووژانەوەی کۆمەڵی ژنان : ئافرەتەکان پرچی خۆیان ڕێكدەخست و لە بەردەم پیاوان گفتوگۆ خۆشتر و نەرمتر و جوانتر دەبوو • دەمەتەقێ کەم دەبوو ، لۆمە ، ڕەخنەگرتن ، سکاڵا و قسە بە خەڵك گوتن نەدەما •

ئەم پیاوانە بۆ زۆری ژنەکان غەریب بوون • بھاتایە ئەورووپایی بواین دەبوە کارەسات • ژنان هەموو رایاندەکردە ژوورەوە و حەوشەکەیان بۆ پیاوەکان بەجێدەهێشت • ئەمەیان بکردایێ ، واتا هەموویان بۆ عاباکانیان رایانبکردایێ ، هەموو دەشلەژان و دەکەوتنە سەر یەك • بەلام پیاوەکان کورد بوون و خەڵکی شارەکە بوون ، لەبەرئەوە ئافرەتەکان تەنیا سەر و ملی خۆیان پێچا و وەکو کەس بۆ ئەوێ نەهاتبێ لەسەر دەمەتەقێی خۆیان دەوامیان کرد • پیاوەکانیش بە هێواشی و بە بێدەنگی لەپشت ژنەکانەوە ڕێگای خۆیان دۆزیەوە و چوونە ژوورەوە • باوك کراسە درێژەکەی شەوی لەبەرکرد و بە بێدەنگی بە پەیژەکەیا بۆ سەربان سەرکەوت تاکو لەوێ لەسەر چوارپایەکەی بنوێ • کوڕەکەش بێجامەکەی لەبەرکرد و بەدزیەوە چوە سەر دەسشۆر و دانەکانی پاككردەوە و دەس و دەم و چاو ، پێی شۆری • ئەمیش بە بێدەنگی بەسەر پەیژەکەیا هەڵکشا و چوە سەربان تاکو لەسەر چوارپایەکەی بنوێ •



چایی لێنان لەسەر سەکۆی قوڕینی بەرماڵ
ئاو لە تەنەکە نەوتا هێنراوە بۆ چایەکە . تۆپزاوا



کچی ماڵ چێشت لێ ئەنێو بە چیچکانەوە بەدیار
ئاگردانەکەوە دانیشتووە . تۆپزاوا



بزن دۆشین لە شاخەکانی سەروو تۆپزاوا



خانوە دێهاتی‌یانەکەم لە کێلکەکەی شێخدا لە تۆپزاوا

من له دەمەتەقێی ژنان وەڕس بووم و تەماشای پیاوەکانم دەکرد • بەڵێ ئەو دەمە نەختێ کوردی تێدەگەیشتم ، بەڵام کە هەموو پێکەوە قسەیان دەکرد هیچ حاڵی نەدەبووم •

چوارپایەکەی منیش لە سەربان بوو • من حەزم دەکرد و دڵخۆش بووم کە لەسەر سەربانە قوڕینەکە لەژێر عاسمان بخەوم • دیتنی باری دنیا لەپاش مەلابانگدان زۆر خۆش بوو • هەستێرەکان لەپێشدا وردە وردە کاڵدەبوون ، بەڵام عاسمان هێشتا نیوە تاریك بوو • لەپاشا وردە وردە ڕۆژ هەڵدەهات • لە سەربانەکان چاوم بە خەڵك دەکەوت لێفەکان هەڵدەدەنەوە• دایکەکان لەسەر لانکەکان پەردە لادەدەن•لە پاشا نوێنیشەو کۆدەکرێتەوە و دادەپۆشرێ و تەنیا چوارپایە ڕەقەکان دەمێنن • هەموو شارەکە لەگەڵ یان پێش هەڵاتنی ڕۆژ لە خەو هەڵدەستن •

**دەستە بەرگە کوردیەکەم**

ئەو دەستە بەرگە کە بۆ من کرابوو زۆر جوان بوو • شەرواڵەکە لە سورمەی سوور ، سوخمەکە سووری کاڵ و کەواکە سورمەی سپی بوو • کەواکە لەسەر دەستووری کوردان درێژ بوو و دەگەیشتە سەرزەوی • بەرگی ژنە کوردەکان لە بەرگی ژنانی ئەورووپای سەدەکانی ناوەندی ڕەنگاورەنگ دەچێ • کراسەکەم دوو فەقیانەی درێژی هەبوو کە لە زەوی دەخشان • بەڵام تۆ لە دەمی کارکردن دەبێ سەری فەقیانەکان بەیەکەوە ببەستێ و بیخەیە پشت ملت ، ئەودەمە قۆڵ هەتا ئانیشك ڕووت دەبێ و دەتوانی بەئاسانی چێشت لێنێی ، ئامان بشۆی یان دەزنوێژەکەت تازە کەیتەوە • بەڵام لە دەمی نوێژکردن دەبێ فەقیانەکان بکرێنەوە و شۆڕ بنە خوارەوە • کەوایێکی درێژیش هەیە بە لۆکە پڕکراوە و لە سورمەی سوور دروستکراوە • بۆ سەرم فێسێکی ڕەش هەیە کە پارچە زێڕێکی پێوە دووراوە لەگەڵ سەرپێچێك • شەرواڵە درێژەکەم تەرجومانەکەم قوماشەکەی

بۆ کڕیم و خۆی بە مەکینە دووری • جووتێ سۆلیشی بۆ من بە دروستکردن دا کە نەخشی زێڕی پێوەیە • تەرجومانەکەم خۆی قوماشی بەرگەکەمی کڕی ، خۆی بڕی و خۆی بە دەس و بە مەکینە دووری • بڕینەکەی ئەوەندە وەستایانە بوو هیچی لێ بە فیڕۆ نەچوو • ئەو لەباتی ئینج و پێی ئێستامان بە بست و پەنجە پێوانەکانی ئەگرت و لەپاشان دەیبڕی •

بۆئەوە بزانم پارچە بەرگەکانم چۆن لەبەر دەکرێن چوومە لای خانەخوێکەی دێیەکەم و پارچەکانم پیشانی کچی ماڵەکە دا کە باش تێم بگەیێنێ چۆن بە باشی لەبەریان کەم • ئێمە لە رۆژئاوا وا فێری لەبەرکردنی جلی خۆمان بووین ، لێرە ترسام نەزانم ئەم جلە کوردیانە بە باشی لەبەرکەم • لەوێ کچەکە جلەکانی خۆی داکەند و پارچە بەرگەکانی منی لەبەرکرد • کچەکە لە جل گۆڕینەکەی هیچ لایێکی بچووکی گیانی رووتی خۆی دەرنەخست • ئەمە ئەم رووداوەی خوارەوە دەخاتەوە بیرم •

جارێکیان کچەکە ویستی لەبەرکردنی بەرگی هاوینی دینمارکی تاقی کاتەوە • بەرگەکەم پێ دا و لەبەری کرد • لە دوورەوە راوەستام تاکو بە کامێرەکەم وێنەی بگرم • لەو کاتە دوو ئافرەتی دێیەکە لەوێوە تێپەڕین • لەپڕێکا کچەکە لە بەرچاوم بزر بوو • لەپاش گەڕان لەلای ئاگردان بە کزی و ماتی دۆزیمەوە • لەوێ لەسەر پێی هەڵتووتابو و بە دەسەکانی ئەژنۆ و قۆڵە رووتەکانی داپۆشیبوو ، چونکە کراسەکە هەتا ئەژنۆی دەگەیشت و قۆڵیشی زۆر کورت بوو • کچەکە بە ترسە ترسەوە تێی گەیاندم کە شتێکی خراپی کرد و جلێکیوا بێئابڕوانەی کردە بەری کە ئەژنۆ و لاق و قۆڵەکانی بە رووتی دەرخست • لەپاشا گوتی : « خوا و ڕاستان کەس بەم حاڵە خراپە نەیدیم • لەبەرئەوە بۆ دەقیقەیێکیش بێ ئابرووم نەچوو » • گریمان (واتا بابڵێین) یەکێ لە دێیەکە بڵاوی کردەوە کە بەرزترین کچی ئاوایی ئەو چەشنە بەرگەی ـــ با بۆ دەقیقەیێکیش بێ ـــ

لەبەرکردوە ، با لە ماڵی خۆیشی بێ ، ئایا بەم‌کردەوەیە ناوی خراپ نەدەبوو ؟

ئەو لە بەرگە کوردیەکەم زۆر رازی بوو • بە خۆشیەوە تەماشای رەنگەکان و پێکەوە ریك‌کەوتنی ئەم رەنگانەی دەکرد • بەمە زانیم هیچ دەستوورێکی یان بیرێکی ئەورووپایی لە رەنگەکان و پێکەوە گونجانیان کاری نەکردوە • تەنیا لە یەك شت حەزی نەدەکرد ئەویش رەنگی سووری کەوا درێژەکە لە هەمان رەنگی سوخمە و سەرپۆشەکە بوو • لەبەرئەوە لەپاشان کەوا سوورەکەم بە یەکێکی‌تری سورمەی پیرۆزەیی گۆریەوە • ئەگەر ئەمەم پێشان کچە هەرزەکارەکە بدایێ زۆر دلنیام کە حەزی لێ دەکرد • کچەکە ئەو جلە کوردیەی لەبەرکرد کە لەگەڵ خۆما بۆ دێنمارك دەمبرد و زۆر پێی خۆش بوو • لەگەڵ ئەوەشدا من نەختێ کوردی فێربووبووم ، بەڵام نەمدەتوانی تێی‌بگەیێنم ئەم بەرگە وەك لێرە دیارە لە دێنمارك وا زۆر جوان دیار نابێ با کچێکی لە تەمەن ئەویش لەوێ لەبەری‌کا • جارێ کچەکان لەوێ بە پێیەتی لە ناوماڵ ناگەرێن • لەبەرئەوە ناتوانن وەك کچانی ئێرە جوان و قیت و قۆز و ریك بەرێوەبرۆن •

## چوونە سەر کانی و هێنانی ئاو

کچ و ژنانی ئێرە کە دەچنە سەرکانی و تەنەکە ئاوەکانیان دەخەنە سەر شانیان وا راست و قیت دەرۆن تۆ حەزدەکەی هەر تەماشایان کەی •

پێش ئەوەی بێمە کوردستان بیرای بیرای نایەتە بیرم جارێك چەند بەرداغ ئاوم خواردبێتەوە • ئێمە لەوێ شتی دەخۆینەوە وەك شەربەت و شەراب • کە گەرامە ماڵەوە زۆر حەزم‌دەکرد تەماشای بەرداغێکی ئاو بکەم کە پارچەی بچووکی بەفری تێدابێ • لە تەماشاکردنی ئەو بەرداغە ئاوە بیرای بیرای تێر نەدەبووم • لێرە لە دێیەکەم کانییەکی باش هەبوو نزیك ماڵەکەمان • ئاوەکە هەڵدەقولیە ناو حەوزێکی چوار قورنە و لەوێوە بەهۆی پلووسکێکەوە دەرژایە ژێر دیوارێك و بزر دەبوو • کچ و ژنەکان

بەهۆی تەنەکەی نەوتی بەتاڵ ، دۆلکە و کوندە لەم کانیە ئاویان دەهێنا • تەنەکەکەیان دەخستە سەرشانێك و بە دەستێك دەیان‌گرت و قیت بەڕێوە دەڕۆیشتن • بە دەس هەڵگرتنی دۆلکە لەبەر دەسکەکەی ئاسانتر بوو • کوندەکە لە پێستی پاك‌کراوی مەڕ و مالآت دروست‌کراوە • هەڵگرتنی ناخۆش و گرانە • ئافرەت دەربەست دەبێ لەسەر پشتی هەڵیگرێ و لە هەردوو لاوە بە هەردوو دەس بیگرێ و بە شۆڕە شۆڕ بڕوا • کوندەی وا هەیە ئەوەندە گەورەیە دەمەکەی لەلایێکەوە و بنەکەی لە لایەکەی‌تریەوە شۆڕ دەبێتە خوارەوە و ئاو بە پشتی ئافرەتەکەدا دەچۆڕێ • کچی هەرزەکار کە ئاوی هەڵگرت قیت دەڕوا ، پیاو حەزی لێ دەکا و حەزدەکا تەماشای بکا وەکو Elieses حەزی لە Rebekh کرد کە لەسەر بیرێ ئاوی هەڵدەگرت •

بۆ ژنە لادێیی چوونە سەر کانی ماوەیێکی باشە بۆ دەمەتەقێ و بەجێ‌هێنانی زۆر شتی‌تری • لەسەر کانی ئافرەت دەس و دەم و چاوی خۆی دەشوا ، دەسنوێژ هەڵدەگرێ و لەسەر تاتەبەردە لووسە پاکەکان نوێژ دەکا • جارێکیان پیرێژنێکم لەسەر کانی دی • هاتە سەر کانی ، دەم و چاوی شۆری و دانەکانی بە پەنجەی پاك کردەوە • لەپاشان لەسەر حەوزی کانیەکە دانیشت و دەسنوێژی هەڵگرت و لەسەر تاتە بەردەکان نوێژی کرد • لەودەمە زۆر ژن هاتبوونە سەر کانیەکە و خەریکی خۆیان بوون • ئێوارەیێك لە سەربانەوە چاوم بە ئافرەتێکی چالاك کەوت کە تەنەکەیێکی زلی بەدەستەوە بوو و دەهاتە سەر کانی • لەپێشا دەسنوێژی هەڵگرت و سەرپۆشەکەی سەری لە خوار چەناگەی قایم کرد و نوێژی کرد • لەپاشان سەرپۆشەکەی کردەوە و باش لە ملی قایمی کرد • ئینجا تەنەکە ئاوەکەی لەسەر شانی راستی دانا و بە دەستی چەپی رانی چەپی خۆی توند گرت و بە دەستی راستی لەسەرەوە تەنەکەکەی گرت و بە قنج و قیتی کەوتە رێ و لەناو تارمایی ئاوایی بزر بوو •



وێنەیێکی دەسکری لایێك لە تۆپزاوە

## — ٤ —

# منداڵێك و کارەکەرێك

**خانوەکەی تۆپزاوە**

ئەو دێیە (واتا تۆپزاوەی لای دووکان) کە نزیکەی مانگێك تێدا ژیام لەلای کێلگەییێکی گەورەیە کە دەکەوێتە سەر لاپاڵی شاخێکی بەرز • ئەو بەشەی خانوەکە بۆ من تەرخان کرابوو بریتی بوو لە ژووریکی گەورەی بێ پەنجەرە کە دەیڕوانیە حەوشەکە و دوو ژووری‌تری • دیوارەکانی بە خشتی کاڵ دروست و بە گەچ سپی کرابوون • سەری بە دار و چیلکە و حەسیر و لەپاشان بە قوڕ داپۆشرابوو • زەویەکەی قوڕ بوو کە بە چینێکی تەنکی چمەنتۆ داپۆشرابوو و ڕۆژی چەند جارێ بۆ فێنکی ئاوڕشێن دەکرا • پەرەسێلکە لەناو دارەکانی بنمیچ هێلانەیان دروست و لەوێ

بێچووشیان کردبوو و بە جووکەجووك بۆ هێنانی قوڕ و پووش بۆ دامەزراندنی هێلانە و خواردەمەنی بۆ بێچووەکانیان هاتوچۆیان دەکرد • مریشك و جووجەڵەی ناوماڵ پەیتا پەیتا دەهاتنە ژوورەوە و پیسیان دەکرد و بۆ حەوشەکە رایاندەکردەوە • لە تەنشت دیوارەکان دوو قەنەپە و دوو کورسی داری رووت و رەق و ناشیرین راوەستابوون : دۆشەگەکانیان رەق و قۆلەکانیان بۆ دانانی چای ، پان دروستکرابوون • ئەم قەنەپە و کورسیانە بەرامبەر یەکتری بوون و دانیشتووەکان وەك رێبواری شەمەندەفەر دەبوایێ بەرامبەر یەك دانیشن • کە گەرمی هەوا بەرز دەبوو ، کورسی و قەنەپەکان بۆ ناوەوەی ژوورەکە دەبران کە تاریکتر و فێنکتر بووە دوو ژوورەکەی تری تەسکتر بوون و پەنجەرەکانیان نزمتر بوون • لە یەکێ لەم ژوورانە چەند سەنووقێکی ئاسنی رەنگکراوی ماڵ و مێزێك و کانتۆر هەبوون • لە سەرەتای دانیشتنم چوارپایەیێکی ئاسنیش هەبوو ، بەڵام ئەمە لەپاشان بۆ حەوشە گوێزرایەوە • ژوورەکەی تری بە چیمەنتۆ داپۆشرابوو کە لەسەری بەڕە و فەرش بۆ دانیشتن داخرابوون • لەمژوورە گەرماوێکی بچووك هەبوو کە بریتی بوو لە ژوورێکی بچووکی بێپەنجەرە و حەوزێکی تێدا دروست کرابو • تانکییێکی گەورە لە دەرەوە دامەزرابوو، بە ئاو پڕ و بە ئاگر گەرمدەکرا • ئەو ئاوە دەڕژایە ناو حەوزەکەی ناو ژووری گەرماو • تۆ دەتتوانی لەمژوورە لەسەر تەختەیێکی نزم دانیشی و بە کاسەیێکی بچووك ئاو بکەیتە خۆتا و خۆت بشۆی •

لەپشت ئەم ژوورە ژووری گەنجینە (واتا مەخزەن) هەبوو کە دوو سێ کەنووی بەرزی تێدابوو کە بە پەنجە نەخشکرابوون و بۆ پاراستنی دانەوێلە بەکاردەهێنران • بێجگە لەمانە لەم ژوورە ئامێری کشتوکاڵی وەك داس و گاسن هەبوون • ڕەنجبەرەکانی شێخ بۆ وەرگرتنی ئەو ئامێرانە کە پێویستیان بوو بۆ ئەو ژوورە دەهاتن و ئێوارە دەیانهێنایەوە •

لەوێ قوڵێنەی (واتا سەبەتەی) نانی تیری هەبوو و بە قولاپەکانەوە گۆشت هەڵواسرابوو . بەڵام لە هاوینا دەیانتوانی تەنیا بۆ ڕۆژێ لەوێ گۆشت هەڵواسن . لێرە هەندێجار چاوم بە لانکەی هەڵواسراو دەکەوت کە کارەکەرەکە منداڵە کۆرپەکەی تێدا دەخەواند . پێپیلکەیێکی ناشیرینی تاریك بۆ چوونە سەربان لەم ژوورە لە قوڕ دروستکرابوو . لە بەردەم ئەم ژوورانە پێشخانێك تەختکرابوو و لەوێوە پێپیلکەیێکی بەرز تۆی دەگەیاندە حەوشەکە کە لە قوڕ و بە خوار و خێچی دروستکرابوو . ئەم حەوشە ــ لە لایەکەیترەوە ــ بەرامبەر پێشخان ــ جێگای چێشت لێنان ، تەنوور و جێگای نانکردن ، تەویلە و جێگای دەرگای دارینی حەوشە هەبوو کە ئێواران دادەخرا . خانووی ژیان لە خشتی کاڵ و بەرد دروستکرابوو و پلانی خانوەکە ، واتا بناغەی دیوارەکانی هەموو لە یەك بەرزی نەبوو . سەربانەکانیش هەموو لە یەك بەرزی نەبوون : لە پشتەوە بەرز و لەپێشەوە نزمتر بوو . ئەم خانوانە بەپێی بەرزی رووی زەمین لە دامێن شاخەکە دروستکرابوون . خانوەکان نەك تەنیا کەرەستەکانیان رەنگی رووی زەمینی پێدەدان ، بەڵکو لەگەڵ لێژبوونی رووی ئەم زەمینە خانوەکانیش بەو لایە خوار دەبوون . لەم خانوانە هێڵ (واتا خەت) و قوڕنەی راست نەبوون . کونی دەرگا و پەنجەرەکانیش لە دیوارە قوڕینە ئەستوورەکە راست نەبڕابوون ، بەڵکو خوار و خێچ و قوڕنەکانیش راست نەبوون . تۆ سەرت سووڕدەما لەو جۆرە دەرگا و پەنجەرانە کە دەخرانە ئەو کونانەوە ، دەبێ چەندی راست بن ؟

**کەپری ناوباغەکان**

جارێکیان لەتەنیشت کەپرێکەوە تێپەڕیم کە پیرێژنێکی تیا دەژیا و دەرگاییێکیوا خوار و خیچی هەبوو تۆ لەلای دەرگاکەوە دەتتوانی ناو کەپرەکە ببینی . ئەم جۆرە کەپرانە بەهاران و هاوینان لەناو کێلگەکان بۆ

خۆپاراستن له تینی گەرمای هاوین دروست دەکرین • ئەم کەپرانە لە چیلکە و لقەدار دروستکرابوون و سەرەکانیان بە چەند دارێکی خواری سپیدار و چیلکە و چلو و گەڵا دار گیرابوو • گەڵاکان له سەرەتادا سەوزن، لەپاشان وردە وردە زەرد و بۆر دەبن • کێڵگەکانی دەوروپشتی دێیەکە لە دەمی دوورینەوە و بەرهەم کۆکردن ئەم جۆرە کەپرانەیان تیا دروست دەکرێ •

مەبەستی لادێیی‌یەکان لەم کەپرانە خۆپاراستن بوو لە تینی رۆژ • دیوارەکانی هەندێجار بە حەسیریش دادەپۆشران • خێزانی رەنجبەرەکان لەژێر ئەو کەپرانە دەژیان و لەوێش ئاومالی پێویستی خۆیان وەك كاسە و مەنجەڵیان دەپاراست •

پیرێژنەکە کلیلێکی زلی خستبوە دەرگای کەپرەکە ، بەلام تۆ دەتتوانی لەتەنیشت کلیلەکەوە باش دەست درێژ کەی و یەکێکی دەسدرێژ دەیتوانی شتی لێ دەرکا •

که رەشەبا هەڵیدەکرد ، دنیا پڕ دەبوو لە تۆز و خۆڵ ، دنیا بۆر دادەهات و دەرگا و پەنجەرەکان دەکەوتنە جوولەجوول و تەقەتەق • شەوێکیان وا بەهێز پەنجەرەی ژوورەکەم دەجوولایەوە ، نەمدەزانی کەی بەجارێ دەشکێ ؟

## دروستکردنی خانووی قوڕ

دروستکردنی خانووی قوڕ زۆر ئاسانە و زوو دەکرێ • لەپێشدا لە جێگایێك قوڕ دەشێلرا و ئەم قوڕە دەکرایە ئاو چوار چێوەیێکی دارینەوە بۆ دروستکردنی خشتی كاڵ و بۆ وشككردنەوە دادەندرا • لەپاش وشكبوونەوە بەهۆی ئەم خشتە كاڵانە دەس‌دەکرا بە دروستکردنی دیوار • ڕاستی ستوونی (واتا عەموودی) دیوارەکان بەهۆی پەتێك تەك شاقوول

ئەندازە دەکرا • ئەم دیوارانە کە لە دەورەی جێگاکە بەرز دەبوون سەریان بە دار و چیلکە و چڵو دەگیرا • لەپاش تەواوبوونی ژوورەکە بەرماوەی گل و قوڕ لادەبرا و زەویەکەی نەختێ تەخت دەکرا ، بەڵام نەك تـەواو تەخت • لەپاشان دیوارەکان بە قوڕی کادار سواغ دەدرا • بەڵێ ئەم خانوانە زۆر زوو تەواو دەبوون ، بەڵام زۆر پتـەو (واتا قـایم) نەبـوون و زوو دەڕووخـان •

## ئیش‌وکاری ناوماڵێکی گەورەی لادێ

لە ماڵێکی گەورەی وەك ماڵەکەی لادێم ئیش‌وکاری ناوماڵ زۆر بوو• من لە سەرەتادا ئەقڵم بەمە نەدەشکا • بەڵام وردە وردە زانیم هەڵسووڕاندنی ماڵێکی گەورەی وەك ئەم ماڵەی شێخ پێویستی بـە زۆر ماندوویـەتی و ئیش هەیە • لە سەرەتادا من نەمدەزانی چۆن ئەم ئیشانە دابەش دەکران و چەند کەس خەریکیان دەبن •

ئافرەتەکانی ماڵ بریتی بوون لە دایکێك ، کچەکەی و کارەکەرێك • بێجگە لەمانە دوو کچی بچووکیش هەبوون • ئەندامە مێینەکانی خێزانەکە بە بێ‌جیاوازی دەبوایە لەپێشدا نان بۆ ئەندامە نێرینەکان دانێن کە بریتی بوون لە باوك و سێ کوڕەکەی کە بچووکترینیان حەوت ساڵان بوو • ژنانی دێهات لێرە ــ وەك ناوشار ــ پەچە و عەبا ناپۆشن و ژیانی خێزان لەم دێهاتە نەختێ لە هی ناو ڕۆژئاوا دەکا و جیاکردنی پیـاو و کوڕەکان لـە ژن و کچەکان لێرە باش دیار نەکراوە • لەناو خێزانێکی لادێ پیاو و ژن پێکەوە دەژین و هاوکاری دەکەن ، نەك وەك شارستانیەکان کە جیاوازی تێدایە • خزم و هاوسێ و برادەری نێرینەی ماڵەکەمان بۆ دیدەنیمـان دەهـاتن و دەیانتوانی لەگەڵ ژنەکان بە سەربەسـتی قسـە بـکەن • بـەڵام هیـچ ئەورووپایی‌یێك نەیدەتوانی پێ بخاتە ناو ماڵەوە • ئەوان تەنیا هەتا ژووری میوان دەیانتوانی بێن •

جارێکیان ئەورووپاییەیێك بۆ لای من هات • کە لە پێشخانەوە بــۆ ژووری میوان هات نەیزانی لە ژووری ژنــان چی دەکرێ • لــەوێ دوو ئافرەت ، کە کچە گەنجەکە و کارەکەرەکە بوون ، خۆیــان نووســاندبوە دەرگا داخراوەکەوە و هەریــەکە لە کونێکەوە تەماشای دەکرد بۆئەوە کــە پیاوێکی ئەورووپایی ــ کە ببرای ببرای لە نزیکەوە نەیاندیبوو ــ بــاش ببینن و بەمە حەزلێکردنی خۆیان لە زانینی شتی سەیر و ناسینی کەسی بیانی ( واتا بێگانە ) تێر بکەن •

## چــالاکی نــەجێ

زۆربەی ئیش‌وکاری رۆژانەی ماڵ کەوتبوە شان کارەکەرەکە و کچە گەنجەکە • ئەم کچە بەپێی تەمەنی خۆی تۆ سەرت سوورِ دەما چەنــد چوست و بەکار و چالاك بوو • بەڵام کچە بچووکە هەشت ساڵانــەکەی شێخ نەختێ کۆمەکی دەکرد • ئەم کچە جوان و زەلام بوو و قژە درێژەکەی دەهاتە خوارەوە و گوێ گوارەدارەکەی دادەپۆشی •

کچە گەنجەکە لەبەر ئیشی زۆر و ماندوویەتی بە سستی دەبزووت • ئەم کچە هەر لە بەیانی زووەوە ــ لە مەلا بانگدانەوە ــ ئیشی دەکرد هەتا نیوەشەو • رۆژێك کە پێکەوە لە حەوشە تێدەپــەڕین دەســتیم گرت • تەماشامکرد وەك دەستی پیرێژن رەق و وشکە • من لەپێشدا بڕوام نەکرد ، کە دەستەکەیم هەڵبڕی و باش تەماشام کرد ئینجا بڕوام کرد • ئەمە زرِ کچ بوو • لێرە مندالانی ژنی تەلاقدراو ــ کە بچووك نەبن ــ لەگەڵ باوکیان دەمێنن و نادرێنە دایك • بەڵێ بەڕاستی لەگەڵی خراپ نەبوون ، بەڵام لــە دوو کچە بچووکەکان گەورەتر بوو و لەبەرئەوە بــاوکی ئیشی مــاڵی پێ دەکرد • لێرە لە دێهات تەنیا کورِ دەچنە فێرگە (واتا مەکتەب) ، کچــان

ناچن [1] • لەبەرئەوە کە لێرە ئامرازی (واتا ئالەت و ئەدەواتی) ناومال کەمە ، هەموو ئیشێ بە دەست دەکرێ و ئەم کچە گەنجە دەربەست بوو ئیشێکی زۆر لە مالەوە جێبەجێ بکا •

کە یەکێ لە ئەندامی مالەکە لە سەربانی تەنشت پێشخانەکە بیویستایێ دەستی بشوا دەبوایێ ئەم کچە ئازا دەسشۆر و مەسینە و سابوون و ئاو بێنێ و ئاو بکاتە دەسیا • کە پیاوەکان دەهاتنەوە دەبوایێ ئەو بچێ جلی شەویان بۆ دانێ • کە من لەگەل ژنێکیتری نانمان دەخوارد دەبوایێ ئەو خزمەتمان بکا و لەسەرمان راوەستێ و بە باوەشێن مێشەکان دەرکا• لەگەل هەموو دەربڕینی نارەزاییم و قەبوول نەکردنم ئەو کچە بەستەزمانە بە لەشی لاوازیەوە لە حەوزەکەی نزیك ئاوی بۆ ژوورەکەم دەهێنا • من دەربەست بووم بەدزیەوە بۆ خۆم بە دۆلکە و سەتل ئاو بێنم • بەلام کە ئافرەتە گەورەکان پێیانزانیم پێیانگوتم ئەمە عەیبە و شوورەییە • لێرە مێوان نابێ ئیش بکا و ئیشکردنی مێوان شوورەییە بۆ مالەکەیان • خوانەکەران خەلك بەوە بزانن ، رەخنەیان لێ دەگرن • داخەکەم تۆ لەپاش ماوەیێ تەمەل و تەوەزەل دەبی و فێری ئەوە دەبی یەکێك خزمەتت بکا و لە خزمەتتدا راوەستێ •

یەکێتری لە ئیشەکانی ئەم کچە گەنجە ـ کە ناوی ئەجێ ( واتا خەجێ )یە ـ هەلگرتنی قاپ و ئامان و مەنجەلە مسە قورسەکان بوو بۆ شۆرینیان لە سەرکانی • کە چای دەکرا ئەجێ سەماوەرەکەی لە ئاو پڕ دەکرد ، ئاگری دەکردەوە و بە ماشەیێکی درێژ زۆر بەپوختەیی خەلووزە داگیرساوەکانی دەخستە ناو سەماوەرەکە •

---

(1) ئێستا لە هەندێ دێ گەورەکان فێرگەی کچان کراوەتەوە و کچانیش دەتوانن بخوێنن . فێرگەی تایبەتی خۆیان نەبێ دەتوانن لەگەل کوڕەکان بخوێنن •

**وەرگێر**

که سەعات شەشی بەیانی هەلدەستام ئەجێ خەریکی ئیش بوو . کە کچە گەورەکەی شێخ یان کارەکەرەکە بۆ کۆکردنەوەی کەرە خەریکی ژەندنی مەشکەی ماست بوون ئەجێ خەریکی مالینی حەوشەکە بوو . بەلام چۆن مالینێ ؟ بە دانیشتن و بە هۆی گزگێکی کورتەوە حەوشەکەی دەمالی . بەلێ حەوشەکەی باش دەمالی ، بەلام خۆشی باش تۆزاوی و پیس دەکرد . لەپاشان شت و خۆلە مالراوەکەی بە دەستی دەخستە ناو تەنەکەیێکی نەوتی بەتال ، بەمەش دەستەکانی پاکتر نەدەبوو .

رۆژێك سەرەکی مال حەزی لە قەرە خەرمان کرد . هەندێ گولە گەنمی هێنا تاکو لەپشت خانوەکە لەسەر زەوییێکی بەتال بیرژێنرێ . ئەم گەنمە برژاوە لەپاشان بە دەستار دەهاڕرا و دەکرا بە چێشتێکی خۆش کە تامی برنج و کاکلە گوێز دەدا . ژنەکەی کە بە هەلکەوت هاتە دەرێ و سەیری گولە گەنمەکانی کرد رەخنەی لە مێردەکەی گرت و گوتی ئەم گولانە تەواو کاملن و زەردن ، تۆ دەبوایێ گولی نیوە کامل و سەوزت بهێنایێ . بەمە مێردەکەی دلتەنگ بوو و دەموچاوی بە چەشنێك گوڕرا وەك گۆڕرانی دەموچاوی هەر مێردێك لە دنیا کە ژنەکەی رەخنەی لێ بگرێ و خۆی بە داناتر و ئاقلتر دانێ . بەلام مێردەکە لەسەر سەرپەرشتی برژاندنی گولە گەنمەکان دەوامی کرد . گولەکان تەنك بلاوکران بۆئەوە کە باش بیرژێن . بەلام دەبوایێ گەنمە برژاوەکان لابرێن پێش ئەوە کە چینێکی گەنمی تازە رابخرێ . ئەم کارە کەوتە سەرشانی ئەجێی بەسەزمان . ئەجێ گەنمە برژاوەکانی کۆدەکردەوە و دەیخستە ناو تەشتێکی مس و پووشە سووتاوەکانی لادەبرد . ئەجێ هەموو ئەم ئیشەی بە دەستە رووتەکەی دەکرد . ئەو رۆژە با هەبوو و دوکەل بەرزدەبوو و دەموچاوی کچەکەی رەش دەکرد . لەگەل ئەوەشدا باوکی بە ئیشەکەی رازی نەبوو و پەلەی لێ دەکرد . چۆن یەکێك لە کەرێك بدا و کەرەکە بە تیژی بکەوێتە

ڕێ ، هەروا کچەکە بە پەلەپەل دەستی دەخستە ناو ئاگرەکە و گەنمە برژاوەکانی کۆدەکردەوە . دەستەکانی زۆر ڕەق نەبوایێن تەواو دەسووتان. باوکە دلرەقەکە باکی بەوە نەبوو کچەکەی وا لێ بکا و دەستی بسووتێ . کچەکەش لای سەیر نەبوو باوکی بەمچەشنە ئیشی پێ دەکا و ئەمەی بە هەلە (واتا غەلەت) دانەدەنا . وادیارە تەنیا من بە هەلە چووبووم و خراپ بیرم دەکردەوە . کە لەپاش نانخواردن چای دەکرا ، ئەجێ دادەنیشت بۆ شۆرینی ئیستیکانە بەتالەکان و پڕکردنیان : بەلام لەم ئیشە تەنیا نەبوو ، خوشکە هەشت سالانەکەی و برا حەوت سالانەکەشی هەندێجار کۆمەکییان دەکرد . خوشکە بچووکەکەی وەك ئەجێ نەبوو ، بەلکو جێگایێکی تایبەتی هەبوو . ئەمەش لەبەرئەوە بوو لەپێشدا ئەو بچووکتر بوو ، لەپاشان جوان بوو . ئەم کچە بچکۆلەیە لەو تەمەنە هەستی بە جوانی خۆی دەکردە خڕیلە بوو و هەمیشە دلشادی و پێکەنین بە دەموچاویەوە بوو. لە دلی خۆی هەستی بەوە دەکرد کە گەورە بوو دەبێتە کچێکی جوان و زوو شوو دەکا و دەبێتە دایکی چەند منداڵێ . بەلام چاوم لێ بوو کە یەکێ لە براکانی ویستی دانیشێ پالی بەم خوشکە جوانەی دەنا بۆئەوە کە لەسەر لبادەکە لایبا و بۆ خۆی جێ بکاتەوە . ئەجێش جوان بوو ، بەلام هەمیشە ماندوو بوو و لەبەر کەمخەوی شەو لەدوای شەو هێلی ڕەش لەژێر چاوەکانی پەیدادەبوو . لەمبابەتەشەوە خوشکە بچووکەکەی لەو باشتر بوو . ئەو دەیتوانی کەی بیەوێ و چەندێ بیەوێ بنوێ .

**نووستنی منداڵان**

لە کوردستان هیچ منداڵێك بۆ نووستن ناخرێتە ناوجێ . لەبەرئەوە ئەو هەموو هەولدانە کە ئێمە دەیدەین و ئەو ناخۆشیە و کوششە کە ئێمە لە ئەورووپا دەیکەین بۆ نواندنی منداڵ لێرە نایبینین . منداڵان لێرە لەگەل دایك و باوکیان ئێواران هەتا ماندوو دەبن دەمێنن . کە ماندووش بوون

له جێگای خۆیان دەخەون • لەپاشا دەگوێزرێنەوە بۆ ناو نوێنی خۆیان • له ماڵەکەی شاری سواهەیمانیم کە ماوەیێك ژیام منداڵ زۆر بوون و تەمەنیان لە چوار مانگانەوە دەستی پێ دەکرد هەتا دوانزە ساڵ • ئەمانە هەموو لەگەڵ یەك پێکەوە لە جێگای خۆیان دەنووستن و بەسەریەکا دەکەوتن • من چەند جارێ کۆمەکی کەسوکاریانم دەکرد و لەش و قاچ و قۆلیانم لە یەك جیا دەکردەوە و بۆ نوێنە تایبەتیەکانیانم دەبردن تاکو بە رەحەتی بنوون •

کە منداڵ بە رۆژ هیلاك بێ و بیەوێ بنوێ لە جێگای خۆی دەکەوێ و خەوی لێ دەکەوێ • کە یەکێکی دڵنەرم لەوێوە تێپەڕی زوو بە هۆی پۆپەشمین ، سەرپۆشی یان بەرماڵێك دایدەپۆشێ • من کە لە شار دەژیام زۆر جار منداڵێکی نوستوو دەکەوتە سەررێم • منیش دەستوبرد سەرپۆشێکم دەدۆزیەوە و دامدەپۆشی • کە دایکەکان لێرە ئێواران بۆ دیدەنی یەکتری دەچن منداڵە ساواکانیانیش لەگەڵ خۆیان دەبەن • لە ماڵی خانەخوێ هەندێ جار ئەو منداڵانە خەویان لێ دەکەوێ • کە دایك دەچێتەوە منداڵەکەی دەخاتە سەر سنگ و شانی و لەژێر عەبا رەشەکەی هەڵیدەگرێ و لە ماڵەوە دەیخاتە ناو نوێنی خۆی • لێرە ڕەوشتی زۆر توندی لای ئێمە لەبابەت دەس و داو شۆرین و جل گۆڕینی منداڵەوە لەپێشی نووستنا نیە • منداڵەکە کوڕ بێ جلەکەی دەگۆڕێ کراسێکی درێژ یان پێجامە لەبەردەکا ، کچ بێ هەر بە جلەکەیەوە دەنوێ •

کە کچە هەشت ساڵانەکەی ماڵی لادێم دەکەوتە وەنەوزدان لەسەر نزیکترین دۆشەك لەگەڵ برا حەوت ساڵانەکەی دەکەوتن و دەنووستن • خێرا بەهۆی بەرماڵە مووە مەرەزە سوورەکەی یان شتێکی‌تری هەتا ئێوارە دادەپۆشران • لەپاشان دەگوێزرانەوە بۆ ژوورێکی‌تری • کە هاوین داهات و خەڵك لە سەربان دەنووستن ، ئەم منداڵانە ــ کە خەویان دەهات ــ

دەچوونە سەر تەختی نووستنی چوارقورنە ــ کە بۆ هەموان دروستکراوە ــ و لەوێ دەنووستن •ماڵەکانی‌تری ناودێ ئەم چەشنە تەختە باشە چوار قورنەیان نیە• ئەمان یان لەسەر دۆشەگێ دەخەوتن لەسەر زەوی یان دۆشەگەکە دەخرێتە سەر حەسیر و پارچە تەختەییێکی ئاسۆیی (واتا افقی) • ئەم تەختەیەش لەسەر چوار تەنەکەی نەوتی بەتاڵ بەرز دەکرا تاکو خۆیان لە خۆڵی زەوی و دووپشك بپارێزن • کچە هەشت ساڵانەکە باش دەنووست • ڕوومەتی گوپن و سوور بوو و لە ژێر چاوی رەشایی نەبوو •

ئەی کچە دوانزە ساڵەکە ؟! ئەم کچە لەپاش نانی ئێواران دەبوایێ ئامانەکان بشوا • لە تاریکی فانۆسێکی دادەگیرساند و لەناو تەشتێك ئامانە پیسەکانی هەڵدەگرت و دەچوە سەر حەوز بۆ شۆرینیان ، یان هەر بە تاریکی ئامانەکانی هەڵدەگرت و بەناو تاریکیا رێی خۆی دەدۆزیەوە و دەڕۆیشت • هەندێ جار بە تاریکی دەچوە ژووری چێشت لێنان تاکو خەڵوز و پشکۆی ئاگر بۆ لێنانی چای بێنێ • لەو ماوەیە خوشکە گەورەکەی چایەکەی ئامادە دەکرد و لەپشت سەماوەرەکە وەك شاژن دادەنیشت • ئەو دەمە ئەجێ دەهاتە لای و دەستی دەکرد بە بردنی ئیستیکانەکانی چای و هێنانەوەی ئیستیکانی بەتاڵ • ئیشە زۆرەکانی ئەجێ ماوەیان پێ‌نەدەدا لە رۆژانی گەرم پاش نیوەڕۆوان بنوێ • لە مانگە شەوەکان کە لە سەربان چای دەکرا ئەجێ دەبوایێ وەك سێبەریکی بەئارامی بچووك هەتا نیوەشەو چاوەڕێ بکا • کە چای خواردنەوە تەواو دەبوو ئەو دەبوایێ لەتەنیشت خوشکە گەورەکەی وەك پتێکی بچووکی هەژار بێ‌نقەکردن دانیشێ • زۆر جار ئیواران تەماشام دەکرد خەواڵوە و سەری دەبزوێنێ و زۆر ماندوە • من ناڵێم کەس‌وکاری لەبەر دلرەقی گوێیان پێ‌نەدەدا ، بەڵکو لەبەر نەزانین • ئەم کەس‌وکارە نەیاندەزانی مندالی

هەراش لــە گەورە زیـاتر پێویستی بە خەو هەیــە • ئــەم کەس‌وکارە نەیاندەهێشت ببڕای ببڕای ئەجێ بحەسێتەوە • کە خوشکەکەی تەماشای دەکرد ئەجێ وەنەوز دەداو شانی رادەوەشاند چایێکی قورسی بۆ تێدەکرد تاکو بیخواتەوە و هۆشیار بێتەوە • من زۆر دڵم دەسووتـا بــەم کچــە بەسەزمانە کە ماندوویەتی و کەمخەوی رەنگێکی بزرکاوی دابوە دەم‌وچاوە بچووکەکەی • من لە سەرەتادا حەزم‌دەکرد لە دێیەکە ماوەیێــکی درێژتر بمێنمەوە ، بەڵام ئیتر بەرگەی ئەوەم نەگرت لەوە زیاتر چاوم بەو کچــە بەسەزمانە بکەوێ • هەندێ جار خۆم بە خۆم دەگوت : «کچێ هێنی !! تۆ هەقت چیــە بە چەشنی پەروەردەکردنی منداڵی خەڵــکەوە ؟ دڵــم ئەو وەڵامەی دەدا : بەڵێ باشە مافی (واتا هەقی) ئەوەم نیــە • ئــەی هــەقی ئەوەشم نیە بەزەییم پیا بێ و بۆی بسووتێم !

دواجار کە دەنگ‌وباسی ئەجێم بیســت ئەوەبو ســەرەڕای هەمــوو ئیشەکانی دەبوایێ بۆ دۆشینی مەڕ و بزن بۆ زەوی‌ی بێرە بچێ • ئەمــە جاران فرمانی (واتا وەزیفەی) گوڵەی کارەکەر بوو • شوان مەڕ و بزنی دەهێنایە زەوی بێرە و گوڵەش بۆ دۆشینیان دەچوو • بەڵام بیستم گوڵــە ماڵەکەی شێخی بەجێ‌هێشت • لەبەرئەوە ئەم فرمانەش وەك سەربار خرایە سەر شانە بێ‌هێزەکانی ئەجێ •

چــالاکی گوڵەی کارەکەر

گوڵەی کارەکەر کە بێوەژن بوو بەرامبەر نان و جل بۆ خۆی و دوو منداڵی هەموو دەمێ ئیشی دەکرد • من نەمتوانی بزانم گوڵە چۆن و لەکوێ دەنوێ • ئێوارەی درەنگ کچە سێ سالانەکەی دەخستە سەرشانی و کوڕە ساڵ و نیوەکەی دەخستە ژێر قۆڵی و لە یەکێ لە ژوورەکان بزردەبوو • لە ماڵەکە زۆر ژوور هەبوو • هەندێکی دەرگای لەنــاو حەوشــەکە بــوو ،

هەندێکی تری دەرگای لە دەرەوە بوو • وادیارە گولە لەگەڵ دوو منداڵەکەی ــ بێتو ماوەی ئەوەی هەبوایێ بنوێ ــ لە یەکێ لەو ژوورانە دەنووست • ئیشی رۆژانەی درێژ و سەخت و گران بوو • هەندێ جار پێش رۆژهەڵات کەرێك و گوریسێك و بیورێکی هەڵدەگرت و بۆ سووتەنی کۆکردنەوە دەچوە شاخ • لەوێ داری دەبڕی و کۆی دەکردەوە• دارە درێژەکانی هەر بەدرێژی دەهێنایەوە ، بەڵام لقە کورتەکانی لە دارەکە دەبڕیەوە • پاش نیوەرۆیێکی درەنگ بە بارێکی قورسی سووتەمەنیەوە بەپشت کەرەکەیەوە دەهاتەوە • ئەم دارانە دەخرانە ژێر سێ پایەی کوانوو بۆ چێشت لێنان ، یان بە ستوونی (واتا عەموودی) لە سەرەوە راست بۆ نانکردن دەخرانە ناو تەنوور • مەنجەڵە مسە سپیکراوەکە دەخرایە سەر ئەو سێ‌پایەیەی بن‌دیوار بۆ لێنانی پلاو یان قبوولی •

قبوولی پیازی تێدەکرێ و برنجەکە ناپاڵێورێ ، بەڵام پلاو دەپاڵێورێ• لە لێنانی هەردوو چێشتەکەدا برنجەکە لەسەر ئاگر دەم‌دەکێشێ و چێشت‌لێنەر دەبێ لە دیاری بە چیچکان دانیشێ •

تەنوورەکە لەناو ژوورێکی گەورە بوو بە ئاگری دار دادەگیرسا ، کە بەکارنەدەهێنرا بە ساجێك دەمەکەی دەگیرا • هەندێ جار کە سووتەنی بەشی نەدەکرد ، کەییانوو بەدزیەوە هەندێ داری لە گوێسوانە دەردەکێشا ، بەڵام ئەمە بەدەگمەن دەکرا و ئاگایان لەوە بوو زیان لە گویسوانەکە نەکەوێ •

گولە هەرچەندێ بلێی کەیف‌خۆش بوو ، بەڵام هەتا بڵێی چڵکن بوو • شەرواڵێکی درێژی سووری لە پێ بوو ، کەوایێکی گولدار و چاکەتێکی سووری لەبەر بوو • ئەم جلانە هەموو لە قوماشی لۆکەی هەرزان دروست‌کرابوون • بەڵام دەسماڵێکی زیوینی دابوو بەسەر شانیا • ئەم دەسماڵە لەگەڵ جلە هەرزانەکەی ببڕای ببڕای رێك‌نەدەکەوت و لەشی

هەمیشە نەشۆراو بوو ٠ پرچی لە خەنە گرتبوو ٠ ڕەنگێکی سووری ڕەشتاڵەی هەبوو ٠ گوڵە لەبەر کەمی جل و کات و هێز نەیدەتوانی منداڵەکانی بە پاکی ڕاگرێ ٠ کوڕەکەی کە تەمەنی ساڵ و نیوێك بوو هەروا بەسەر زەویدا بە کراسە کورتەکەیەوە گاگۆلکەی دەکرد ٠ ئەم کراسەی هەموو دەمێ چڵکن و تەڕ بوو ، چونکە لەسەر زەوی تەڕ گاگۆلکەی دەکرد و هەندێ جار خۆشی پیس دەکرد ٠ نیوەڕۆوان لەناو لانکە زلەکەی ژووری کێلەر (واتا مەخزەن) دەنووست و دایکی دەیتوانی پارچەکانی لە یەك جیاکاتەوە و تەنیا بێشکە بچووکەکە بباتە سەربان ٠ لەوێ منداڵەکەی لەسەر گونیەیێکی زۆر چڵکن دەنواند ٠ لەو ڕۆژانە کە گەنم دەدورایەوە ، پووشە گەنمی پاکی بە دەس دەکەوت ، ئەمانەی لەناو لانکەکە باش ڕادەخست و منداڵە ساواکەی دەختە سەر ٠ لەوێ حەزرەتی عیسام هاتەوە بیر چۆن بە ساوایی لە ئاخوڕ لەسەر پووش و کا دەنووست ٠ کە من لەوێ بووم منداڵەکە دەیتوانی هەڵسێتە سەر لاقە گێڕەکانی ٠ هەندێ‌جار زۆر بەسەیرەوە پێڵاوی گەورەی لە پێ دەکرد و بەرامبەر دایکی ڕادەوەستا ــ کە دانیشتبوو ــ و خەریکی مژینی مەمکی دەبوو ٠

من هیچ منداڵێکی وا مێشاویم نەدیبوو ، بەڵام وا دیار بوو زیانیان لێ نەدەدا ٠ لەسەر زەویە گڵەکە خەریکی گاگۆلکە بوو ٠ جارێکیان گەیشتە گوێسوانە و لەوێوە بەسەر سەریا بۆ سەر پێپلکە چیمەنتۆکان کەوتە خوارەوە ٠ من برینەکەی سەریم پاك کردەوە و باش پێچام ٠ بەڵام گوڵە وازی لێ نەدەهێنا ٠ هەر سەعات نە سەعاتێ برین‌پێچەکەی دەکردەوە تاکو بزانێ زامەکە چۆنە ٠

خێزانەکە هەتا بڵێی لەگەڵ منداڵەکانی کارەکەرەکە باش بوون ٠ لەکوێ لە ئەورووپا خەڵك دەهێڵێ کارەکەر منداڵەکانی لەگەڵ خۆی

بهێنێ ؟ بەڵام هەندێ جار خەڵکیماڵەکە لەگەڵیان خراپ دەجوولان و منداڵەکانیش بەرگەی ئەوەیان دەگرت و نەدەگریان • دەیانتوانی چییان بوێ بیخۆن و هەندێ جلی کورت لەبەرکەن • جارجاریش دایکیان دەیپەرژا بۆ ماوەیێکی درێژ بیانشوا •

لەپاشا گوڵە رۆژێ دانی دەیەشا و لای رووومەتی پەنمابوو • لە کوردستان زۆر جار دان بە زێڕ پڕدەکرێ و دادەپۆشرێ • کە دان ئێشا تۆ دەچیتە لای دانساز بۆئەوە کە دانەکە بە زێڕ پڕ کاتەوە یان هەڵی کێشێ • لێرە تیمارکردنێکی ناوەند نیە [1] • گوڵە نەیدەتوانی بە زێڕ دانی پڕکاتەوە• داوای حەبێکی کرد کە ئێشەکەی کەمکاتەوە • حەبەکەی وەرگرت و بۆ چەند سەعاتێ ئێشەکە نەما • بەڵام لەپاشان دووبارە ئێشەکە گەڕایەوە •

گوڵە لە قوڕنەی ژوورەکە زۆر بەکزیەوە هەڵتروشکابوو ، وەکو یەکێ هیوای کۆمەکی لە کەس نەکا بە بێدەنگی ئازاری دانەکەی دەکێشا •

من کە تەرجومانەکەم لەگەڵ نەبوو نەمزانی چ باسە و بۆ کەس کۆمەکی گوڵە ناکا و چارەیێکی دانەکەی بۆ نادۆزنەوە !! لەپڕێکا برای شێخ پەیدابوو کە نەختێ ئینگلیزی دەزانی و توانی تێم بگەیێنێ بۆ وا کۆمەکی گوڵە ناکرێ • قسەکە چەند ئاشکرا بوو ئەوەندەش دڵڕەقانە بوو • گوڵە بە نانەزگی کاری دەکرد و پارەی بە دەس نەدەکەوت ، لەبەرئەوەش پارەی نەبوو • چوونە لای دانساز پارەی پێ دەویست ، گوڵەش پارەی شك نەدەبرد • لەبەرئەوە دەبێ لە جێی خۆی دانیشێ و بێدەنگ بێ • گوڵە هەژارە ، ئەمەش هیچی لەگەڵا ناکرێ • من لە قسەکانی کابرا تێگەیشتم هەژاری وەك عەیبێکی لەش ــ وەك پشتکۆمی ــ وایە • چۆن پشتکۆم

---

(١) ئەمە جاران وا بوو . ئێستا لە کوردستان پزیشکی ددان زۆرن کە تیماری ددان دەکەن .

وەرگێڕ

هیچی لەگەڵا ناکرێ و دەبێ هەر بە پشتکۆمی بمێنێ ، هەژاریش دەبێ بە بەشی خۆی رازێ بێ و هیچی لەگەڵا ناکرێ [١] .

بۆ رۆژی دووەم بەڵێنم پێ درابوو کە بە قەمەرە بمبەن بۆ سەر ئیشەکانی دووکان . قسەی پێ‌ناوێ کە بڵێم گولەم لەگەڵ خۆم برد لەوێ دکتۆر لەپێشا دەرزی‌یێکی پینسەلینی لێدا تاکو پەنمانەکەی دانی لاچێ . کە دەرزی لە ڕانی دا توند دەستم گرت . لەپاشان دانەکەی هەڵکێشا ، ڕەحەت بوو . بەمە زۆر سوپاسی منی کرد ، منێ کە چاوەڕێ‌ی ئەو چەشنە سوپاسەم نەدەکرد . لەپاشان خۆی کۆکردەوە و لە شاخەکە هاتە خوارەوە تاکو لەوبەر بۆ ماڵی شێخ بچێت . لەوێ ئیشی زۆر ، کاری زۆر ، ڕەنجی زۆر زۆر چاوەڕێ‌ی دەکرد .

لەپاشا زانیم گولە هەردوو منداڵەکانی خستە سەر پشتی و ڕۆیشت بۆ دۆزینەوەی ئیش لە جێگایێکی‌تری . کە هاوین هاتمەوە تۆپزاوە ، گولە لەوێ نەمابوو و فرمانی ( واتا ئەرکی ، وەزیفەی ) مەڕدۆشین — هەروەکو لەپێشدا گێڕامەوە — کەوتبوە ئەستۆی ئەجێ‌ی بەسەزمان .

**شوانی کورد**

تەماشاکردنی شوان کە ئێواران لە شاخە دوورەکانەوە لەگەڵ مێگەلەکەی دێتەوە دیمەنیکی قەشەنگە . گۆچانەکەی بەدەستەوە لەسەرخۆ بەفیزێکەوە دەڕوا ، فەرەجیەکەی بەسەر شانیەوە لەرەی دێ ، قۆڵە کورتەکانی وەك چەکی فرۆکە شکێن بەدەرەوەن . ئەم فەرەجیە ئەستوورە هەم ئاوی باران دانادا و هەمیش لە سەرما و گەرما دەیپارێزێ . هەندێ

---

(١) ئەی نابێ کەس کۆمەکی هەژار بکا ، ئەی لەو ماڵە گەورەیە ، لە ماڵی شێخ کەسی‌وا نەبوو بگاتە فریای !! من بڕوام وایە براکەی شێخ نەیتوانیوە ڕووداوەکە باش روون‌کاتەوە .

**وەرگێر**

ژن کارژۆلەکانیان لەگەڵ خۆیان بۆ جێگای بێرە بۆ مژینی مەمکی دایکیان هێنابوو • ئەم کارژۆلانە کە بە دەنگە ناسکەکەیان دەیانباڕاند ، دایکەکانیان لەوبەرەوە پێش‌ئەوە بگەنە جێ بە بارەبارِ وەڵامیان دەدانەوە • ئەم ژنـانە یەکە یەکە بزنەکانیان دەناسی • بزن لەپشتەوە • بەپێچەوانەی مـانگا کە لەتەنشتەوە ــ دەدۆشرێ • هەر بزنێك شیری کەمی دەدا ، بەڵام ژمارەیان زۆر بوو • لەپاش دۆشین ژنان سەتڵە شیرەکان دەخەنە سەر دەسیان و هەتا شانیان بەرزی دەکەن و دەیبەنەماڵەوە •

لەم شاخانە تەنیا بزن دەدۆشرێ • مانگاکان ئێوارە دینەوە ناودێ • من لە سەربانەوە چاوم لێیان بوو ، هەموو بچووك و لاواز بوون • هـەر مانگایێ رێگای ماڵی خۆی دەدۆزیەوە و بەدەگمەن بزر دەبوون •

مانگاکانی کوردستان لە هی دێنمارك زۆر جیاوازن • لێرە مانـگا وەك مەرِ و بزن دەلەوەرِێن • بەڵێ لەوەرِی ناو شاخ بەکەڵـکی بزن دێ ، بەڵام مانگا تێری پێ ناخوا • مانگا لەم شاخانە تەنیا درِکە شینە دەدۆزێتەوە ؛ لەبەرئەوە بەراوردی بکەین لەگەڵ مانگای دێنمارك شیری کەمە• پێتو مانگای دێنمارك وەك هی کوردستان رۆژ تا ئێوارە بەرِێوە بێ ئایا چەندی شیر دەدا؟ لەپاش ئەوە ئەم رەشە وڵاخانەم دی تێ‌گەیشتم چۆن لە مەغوولستان گا و مانگای گەرِۆك هەن • لەپێشدا برِوام بەوە نەدەکرد •

**ماست‌کردن و مەشکە ژەنین**

هەموو شیرەکە ، شیری بزن و مـانـگا پێـکەوە زوو بۆ کوڵانـدن دەخرێتە سەر ئاگر • کە ساردبوەوە و گەیشتە پلەی گەرمی لەش نەختـێ هەوێنی ماستی تێ‌دەکرێ و لە جێگایێك لەپاش داپۆشین دادەندرێ ، شەو دەمەیێ و دەبێتە ماست •

لەپاشان ئەم ماستە دەکرێتە ناو مەشکە • ئەم مەشکەیە پێستی بزنـە



ژنە موسولمانێکی چارشێو بەسەر لە هەولێر



ژنێکی عابا بەسەر چارشێوێکی ڕەشی داوە بەسەریا ، لە دەرگایەکی بچووکی ناو دیوارێکی قوڕەوە ئەچێتە ژوورەوە لە ماڵەکەی بەرانبەر ماڵی خانەخوێکەم لە سلێمانی .



دایك و منـــاڵ ــ هەڵەبجە
مناڵ تا دوو ساڵ پڕنەکاتەوە لە شیر نابڕرێتەوە

به مازوو خۆشه‌کراوه و له ژوورێك بۆ ماوه‌ی دوو هه‌فته به دووکه‌ڵ قانگ دراوه •

مه‌شکه‌که هه‌موو لایێکی ده‌به‌سترێ ، ماسته‌که‌ی تێ‌ده‌کرێ و ئافره‌تی ماڵ ده‌س‌ده‌کا به ژه‌نینی • له‌پاش چاره‌که سه‌عـاتێ ئـاوی تێ ده‌کرێ و دووباره ده‌ژه‌ندرێ • له‌پاشان ده‌کرێته‌وه و که‌ره‌که‌ی (واتا نویشکه‌که‌ی) لێ ده‌رده‌هێنرێ • دۆیه‌که که ده‌مێنێ ده‌خورێته‌وه ، به‌ڵام خه‌ڵك زیاتر حه‌ز له ماستاو ده‌که‌ن : ماستاو به‌تامتر و چه‌ورتره • ئه‌م که‌ره‌یه بۆنێکی سه‌یری بزنی لێ دێ و کورده‌کان بۆ چێشت‌لێنان به‌کاری‌دێنن ، سپیه و نه‌رمه به‌ڵام من حه‌زم لێ نه‌کرد •

ئه‌م که‌ره‌یه له کووپه‌یێکی شین کۆده‌کرێ و خوێی به‌سه‌را ده‌کرێ • هه‌ندێ‌جار کوڕه حـه‌وت ساڵانـه‌که‌ی مـاڵ ــ که هیـوای دواڕۆژی خێزانه‌که‌یه ــ که برسی ده‌بێ و حه‌ز له شتێکی خۆش ده‌کا ، ده‌چێته سه‌ر کورسیێك و کووپـه‌که داده‌گرێ و نه‌ختێ که‌ره‌ی نـه‌رم و شـلی لێ ده‌رده‌کا و داده‌نیشێ و له‌گه‌ڵ نانی تیری ده‌یخوا •

**نـانی تیری کردن**

نانی تیری پـان و زۆر ته‌نکه • ئێـسکی ( واتا شکڵی ) وه‌ك جغزه • خه‌ڵکی لادێ‌کان و زۆری شارستانیه‌کان خۆیان نانی خۆیان ده‌که‌ن • ئه‌و خیزانه که له‌گه‌ڵیان له لادێ ده‌ژیام که بریتی بوون له ده که‌س هه‌فتـه‌ی دوو ــ سێ جار نانیان ده‌کرد • که ژنه‌کان ده‌سیـان به هه‌ویرشـێلان و نان‌کردن ده‌کرد به‌سه‌یره‌وه جلی خۆیان نه‌ده‌گۆڕی • هـه‌ر به به‌رگه‌که و سه‌رپێچه سورمه‌داره‌که‌ی خۆیانه‌وه داده‌نیشتن و ده‌ستیان به نـان‌کردن ده‌کرد • لێره وادیاره بۆ کارکردن جل‌گۆڕین نیه •

نانه‌وا ته‌نیا نه‌قیانه‌کانی هه‌ڵده‌پێچا و به قۆلیه‌وه ده‌یه‌ست بۆئه‌وه که

له تەنوورەکەدا نەسووتێ • ژووری تەنوورەکە ئامێری جووتی لێبو و لەسەرەوە مەشکەی تازە بۆ قانگدان هەڵواسرابوو • هەویرەکە لەسەر زەوی دەشێلرا و دەکرا بە گوندك • ئەم گوندکانە دەخرانە سەر پارچەیێك پلاستیك بۆئەوە کە بکرێن بە نان • قوماشی پلاستیك و بەتەرێی رادیۆ لە هەموو جێگاییێك هەن و بوونەتە بەشێك لە ژیاری (واتا حەضارەتی ، کەلچەری) ئەم ولاتە •

دایك و کچ بەرامبەر یەك لەسەر لبادێك دادەنیشن • لە بەردەم هەریەکێکیان پنەییێکی دارینی نزم دانراوە ، هەر پنەیەك سێ قاچی هەیە • گوندکی هەویر دەخرێتە سەر پنەکە و بەهۆی تیرۆك هێواش هێواش پان دەکرێ هەتا ئیسکێکی (واتا شکلێکی) جغز وەردەگرێ • من وامزانی ئەمە ئیشێکی ئاسانە ، چونکە من لە دینمارك هەویرم بۆ کێك دروست و پانم کردبوو • بەلام لێرە داخەکەم نەمتوانی هەویرەکە باش پانبکەمەوە • کچە سێ ساڵانەکەی گولە لە من باشتر هەویرەکەی پانکردەوە و تەنکی کرد • وادیارە ئەم ئافرەتانە لە مندالیەوە لە تەمەنی سێ ، چوار ساڵانەوە فێری ئەم هونەرە دەبن ، لەپاشان وازی لێ ناهێنن و لەبیریان ناچێ •

لەپاشا ئەم هەویرە تەنکە دەخرێتە سەر مادە بۆئەوە کە بدرێ بە تەنووردا • مادە ــ وەك دەسکێش ــ جێدەستی هەیە و نان پێوەدەر کە لەوێ گولە بوو زوو دەستی دەخستە ناوی و هەلی دەگرت و نانەکەی دەدا بە تەنوورەکەیا • پاش نەختێ دەبرژا و دەردەهێنرا و دەخرایە ناو سەبەتەیێکی (قولینەییێکی) گەورەوە • ئەم نانە تیریە بە تازەیی خۆش و بەتامە و لەپێش خواردن دەبێ نەختێ بە ئاو تەڕ بکرێ •

لەکاتی نانخواردن ، نانی تیری بە قەدکراوی ــ وەك قاقەزی Serviette ی لای ئێمە ــ لەسەر سینی چێشت دادەندرێ • نەك تەنیا چێشت لەگەل نان دەخورێ ، بەلکو چێشتەکە بەهۆی نانەکە دەخورێ•

پارچەیێ نان وەك کەوچك لوول‌دەدرێ و برنج ، گۆشت و کەبابی تێ‌دەخری و دەخورێ . کەباب وەك هەمبورگەری ئەورووپایە بەڵام درێژۆلکەیە و لەسەر ئاگر دەبرژێنرێ .

**نانی دێنمارك**

لە لادێکە من چەند جارێ باسی چەند جۆری نانی دێنمارکم بۆ کردن . کە باسی نانی بۆری چاودارم کرد ، هەموو بەجارێ گوتیان ئەوە چۆن نانێکە ، ئەوە چۆن دەخورێ !! لە وڵاتی ئینگلیزیش نانی بۆری چاودار [1] ناخۆن . لەپاشا حەزم‌کرد سەموونی گەنمی ئەورووپایان پێشان‌دەم . لەسەر ئیشەکەی دووکان نانەوایێك فێری دروست‌کردنی سەموونی گەورەی ئەورووپا بووبوو کە لە ئاردی گەنم دەیکردە جارێکیان سەموونێك لەمانەم هێنایە ناو ژنانی دێیەکە . لەپێشا کەوتنە سەری پارچە پارچەیان کرد ، ناوەخنە نەبرژاوەکەیان فرێ‌دا و توێکلەکەیان خوارد . جاری دووەم لەگەڵ سەموونێکی ئەورووپایی پاکەتێ کەرەی دێنمارکم بۆ ناردن کە ئەو دەمە لە عێراق دەفرۆشرا و ئێمە لە دێنمارك کەرەی تەلەفۆنی پێ‌دەڵێین لەبەر وێنەیێك کە لەسەریەتی و لە تەلەفۆن دەچێ . کە هاتمەوە تەماشام‌کرد کەس دەسی نەداوە نە لە سەموونەکە و نە لە کەرەکە و کەس نەیزانیوە چۆن پێکەوە دەخورێن . من دەربەست بووم سەموونەکە پارچە پارچە بکەم ، بەڵام چەقۆی سەموونبڕم دەس‌نەکەوت . ئەمە سەیر نیە لە وڵاتێك هەر پیاوێك خەنجەرێکی کردوە بە بەر پشتوێنەکەیدا ، کەچی تۆ

---

[1] چاودار Rxe بە ئینگلیزی جۆرە دانەوێڵەیێکی گەنم ڕەنگی درێژۆلکەیە کە لە ڕۆژاوای تورکیە و لە ئەورووپا هاوینان شین دەبێ . دەکرێتە چێشت و نانی لێ دروست‌دەکرێ . نانەکەی نەرمە و وەك نانی گەنم زوو ڕەق‌نابێ . لەبەرئەوە ئەڵمانەکان تێکەڵی گەنمی دەکەن و نانی لێ دروست‌دەکەن ، نانەکەی هەم بەتامە و هەمیش بە نەرمی دەمێنێ .

وەرگێڕ

ناتوانی چەقۆیێکی درێژی سەموونبڕ بدۆزیەوە [1] • هەرچۆنێک بۆ نانەکەم پارچەپارچەکرد و کەرەم پێوە کرد و پێمدان • لەبەر بەئەدەبی و دڵ نەشکاندنی من گوتیان خۆشە و بەتامە • بەڵام من بڕوا ناکەم پێیان خۆش بووبێ ، چونکە ئەم جۆرە کەرە و نانە لەگەڵ ئاو و هەوا ، جێگا و خۆراکەکانی تری ئەم ناوە نالوێ • لەو رۆژە بەدواوە ئیتر هەر نانی تیری کوردم بەتام و لەزەتەوە دەخوارد و بیرای بیرای بیری سەموونی ئەورووپام نەکردەوە •

---

(١) ئەم جۆرە چەقۆیانە کە دەمیان وەک مشارە لە عێراق تەنیا لە بەغدا بەدەس دەکەوێ . لە لادێکان و لە سولەیمانی چەقۆی سەموونبڕ نیە ، چونکە سەموونی گەورە نیە کە بە چەقۆی تایبەتی ببڕێ . لەپاشا لە دێیەکە چەقۆیێکی گەورەی گۆشتبڕ هەر دەستدەکەوت کە سەموونەکە بە باشی ببڕێ .

وەرگێڕ



وێنـەی دەسکردی پێشخانێك لـە تۆپزاوە

## ــ ٥ ــ

# ئەو منداڵــە کە مرد

لە ماڵەکەی ناوشارم لەو ژوورە کە پـاش نیوەڕۆوان ــ کە دنیـا ئەوەندە گەرم دەبوو تو نەتدەتوانی لە دەرەوە بی ــ دەنووستم ، بۆنێکی خراپ هاتە لووتم • لە سەرەتادا وامزانی ئەمە لە زەویەکەوە دێ • بـەڵام ئەو زەویە کە بە قوڕ سواغ درابوو ، هەموو رۆژێ بەهۆی گزگێکی کورتی گەڵای دار خورما دەماڵرا و ئاوڕشێن دەکرا • لەپاشا وامزانی ئەم بۆنە لـە دۆشەگەکەمەوە دێ کە بە لۆکە پڕکراوە و لەسەر حەسیرێـك راخراوە و لەسەری دەنووم • بەڵام نەء ، ئەم بۆنە لەوێوە نەدەهات • خۆ بۆنەکە لـە دیوارەکانەوە نەدەهات کە بە قوڕ سواغدرابوون و چەند سنگێکی پێـوە بوو و جل و شتی لێ هەڵواسرابوو • خۆ ئەم بۆنە لەو سەنووقە ئاسنانەشەوە نەدەهات کە لەبن ژوورەکە کۆمەڵ کرابوون• خۆ بۆن لە کەتتۆرەکەشەوە نایێت کە هەمیشە داخرابوو • لەم کەتتۆرە جل گورمیلە کرابوو • جاران جلی لێ هەڵدەواسرا و ئێستا بە گورمیلەیی دادەنرێ ، ئەمـەش هەقمـان

بەسەریەوە نیە • لێرە جل لە هەموو شوێنێ دەپارێزرێ : لەناو کەتتـوّر ، لەناو سەنووقی ئاسن ، تەنانەت هەندێجار دەخرێنە سەر سنگەکانی نـاو ژوور • ئینجا چاوم بە بنمیچەکە کەوت کە جوان بە گونیە داپـۆشرابوو • دەمزانی لەژێر گونیەکان داری سپیدار هەیـە کە ژوورەکەی پێ دارەڕا کراوە و لەسەر ئەمانەشەوە حەسیر و چینێکی ئەستوور قوڕ هەیە • بەڵام لەپاشا چاوم بە پیتەکانی D.D.T. کەوت • ئەم نیشانەیەم لە هەموو شوێنێ دەبینی • وادیارە هەموو کوردستان ، دێهات و شارەکان بەم دەرمانە لە جڕ و جانەوەر پاكکراوە • وادیارە ئەم بۆنە ناخۆشـە کە لە ژوورەوە دەهاتە لووتم بۆنی ئەو دەرمانە بوو •

لەم ژوورە کورسی و قەنەپە نەبوون و ئەو فەرشە کە زستانان رادەخرا لەبەر گەرمای هاوین هەڵگیرابوو و لە ژوورێکیتری تاقەت کرابوو • لـەم ژوورە تەنیا حەسیرێك و دۆشەگێك هەبوون کە بۆ نووستنی پاش نیوەڕۆم ڕادەخران • هەندێجار نیوەڕۆوان سینییێکی گەورەی مسیان بۆ دەهێنام کە نانی نیوەڕۆی لەسەر بوو و لەسەر زەویە رووتەکە دادەندرا • لە شار و لادێ خۆراك برێتێ بوو لە قاپێکی گەورەی برنج و دوو قاپ شلە • ئـەم شلانە سەوزە بوون کە لەگەڵ دۆشاوی تەماتە و گۆشت لێنرابون • بـۆ قاپە شلەکان دوو کەوچك هێنرابوون ، بەڵام برنجەکە کەوچکی تایبـەتی نەبوو • هەنـدێ نانی تیریش بـە تەڕکراو و قـەتکراوی وەك قـاقەزی دەسـەسڕی Serviette ی خۆمان لەسەر سینیـەکە دانرابـوو • چەتاڵێکی خۆم بۆ خواردنی برنج هەمیشە لەوێ بوو • چونکە من هێشتـا نەمدەزانی بەهۆی پەنجەکانم نان بخۆم ، هەندێ لە برنجـەکە دەرژایـە خوارەوە • بەڵام من وردە وردە فێری ئەوە بووم بەهۆی پەنجەکانمەوە بـە پوختی چێشت بخۆم • بۆ وێنە لە قاوەڵتی بـاش فـێری ئەوە بووبـووم پارچەیێك نانی تیری بخەمە ناو تاسە ماستەکە و نەختێ ماستی پێ هەڵگرم و

بیخۆم • لەپاش هەر نانخواردنێ چای زۆر گەرمیان بۆ دەهێنام • ئـەم چایە هەمیشە لەلایەن ژنە گەورەکەوە دەکرا ، کە پرچی ڕەش بوو و هەموو دەمێ بە چیچکانەوە دادەنیشت ، واتا ئەژنۆکانی بەرز دەکردەوە و لەسەر جمگەکانی ڕانی دادەنیشت و جێگاییێکی زۆر کەمی لـە زەوی دەگرت • بەمجۆرە لەپشت سەماوەر ، یان دەوری گۆشت دادەنیشت کە بۆ چێشت ئامادەی دەکرد • هەر بەمجۆرەش دەیتوانی جل لە ئوتوو بدا یان لە حەوشە جل بشوا • زۆر جار دەمبینی لەسەر زەوی دانیشتوە و سەوزە پاكدەكات و یەکێ لە لاقەکانی درێژکردوە ــ وەکو لاقی ئەو نەبێ ــ وەك مەکینە پێشکی منداڵی رادەژەنی • ئەو منداڵە کە ڕایدەژەند هی خۆی نەبوو هی هەوێکەی بوو • ئەو ژنی گەورە بوو ، دایکی سێ منداڵی گەورە بوو کە لە یـانزە منداڵ مابوونەوە • ئەم ئافرەتە تەمەنی منداڵە بچووکەکەی نەدەزانی و خۆی ئیتر لەبەر گەورەیی تەمەنی منداڵبوونی بەسەر چووبوو • پرچە سپیەکەی بە خەنە و وسمە رەشدەکرد • من تەمەنی لە سەرەتای پەنجاکان دادەنێم[1].

ئەو منداڵە بچووکترین منداڵی ژنە بچووکەکە بوو کە ئـافرەتێکی کەلەگەت و جوان و قۆڵ و قاچ ئەستوور بوو • لەپێـش مـارەکردنی ، مێردەکەی لە ژنە گەورەکەی پرسی ئایا ئەم ژنە جاهێڵە وەك خوشکی خۆی بە ئەندامێکی تازە لە ماڵەوە قەبـووڵ دەکا • هـەردوو ژنـەکە پێـکەوە ڕێكبوون ، ئیشوکاری ماڵەوەیان بە هاوکاری دابەشدەکرد و منـداڵی یەکتریان وەك هی خۆیان خۆش دەویست و بە نۆرە ئاگایان لێ دەبوو •

ئەو منداڵەی ناو پێشکەکە کوڕ بوو و تەمەنی نزیك شەش مانگ بوو و لە لەشساغی باش نەبوو • دایکی شیری نەبوو و ئەو تەنیا دایکێ نـەبوو کە لە کوردستان تووشی بم و بۆ منداڵـەکەی بەرمەمکی شـیری نەبێ •

---

(1) واتـا لە پەنجاوە هەتا پەنجا وسێ •

وەرگـێڕ

جارێکیان بۆنەی ئەمەم لە دکتۆرە ئەڵمانەکەی سولەیمانی پرسی • هۆی ئەم بێشیرییە زگپڕی یەك لەدوای یەکە کە دایك لێی ناحەسێتەوە تا مەمکی شیرا بێ • سەرەڕای ئەم بۆنەیە کەمی و ناتەواوی خۆراك و کەمی پرۆتین (واتا گۆشت و شتی وەك گۆشت) دەبنە هۆی وشك‌کردنی شیری دایك ، دایکێ کە چێشت لێ بنێ دەبێ بە بەرماوە رازی بێ •

ئەم منداڵە شیری ئاردی پێدەدرا کە لەگەڵ ئاو تێکەڵ دەکرا • من ئاگام لە پایەی پەیتی شیرەکە و پلەی گەرمی بوو • بەڵام وابزانم شووشە شیرەکە و مەمەکەی باش بە ئاوی گەرم پاك نەدەکرایەوە • لەپاشان هەندێ‌جار چای خەست و ئاوی نەکوڵاوی پێدەدرا و بەفری تێدەخرا • ئەم بەفراوانە ــ کە بڕوا ناکەم پاك بن ــ وابزانم لەگەڵ ورگی منداڵەکە رێك نەدەکەوتن •

ئێمە دەربەست بووین منداڵەکە بەینە سەر دکتۆر • دایکی منداڵەکەی لە باوەشی لەژێر عەباکەی دانابوو و هەندێ پەڕۆیشی خستبوە ژێری • کە دکتۆر چاوی پێکەوت ، سەری راوەشاند و گوتی « سك‌چوونی سەوز » و دەرزی بۆ نووسی • ژێکی برینپێچ هەموو رۆژێ دەهاتە ماڵەوە و دەرزییێکی لە منداڵە بچووکەکە دەدا • ئەم برینپێچە یەکێ لە ژنە خوێندەوارەکان بوو کە لە فێرگە (واتا مەکتەب) فێری پیشەی خزمەتی نەخۆش کرابوو • لێرە ئێستا بۆ ئافرەتان تەنیا دوو پیشە هەیە : خزمەتی نەخۆش‌کردن و بوونە مامۆستا لە فێرگەی کچان [1] • زۆربەی ئەوانەی خزمەتی نەخۆش دەکەن لە نەخۆشخانەکان هێشتا پیاون و خەڵك بە چاوێکی نزم تەماشای ئەو ئافرەتانە دەکەن کە ئەم پیشەیەیان هەیە •

---

(١) ئێستا ئافرەت لە عێراق لە زۆر کاریتری وەك دابرەکانی میری و شیرکەتەکان دادەمەزرێ •

وەرگێڕ

لەبەرئەوە تەنیا کچانی هەژارەکان دەربەست دەبن بین بە برین‌پێچ [1] •

برین‌پێچەکە بە بەرگی سولەیمانی و بە پەچە و عەباوە دەهات • لەژێر عەباکە کراسێکی سووری لەبەر بوو •

منداڵەکە رۆژبەرۆژ لاوازتر دەبوو • هەندێ لە ژنە دراوسێکان بە مەمك شیریان پێ‌دەدا ، بەڵام سوودی نەبوو •

دایکە بەسەزمانەکە منداڵەکەی لەسەر رانەکانی دادەنا و بە بێ‌دەنگی و ناهومێدی دەینواڕیە منداڵەکەی و دوور • خوشکەکانی هەندێ‌جار هەڵیان‌دەگرت و دەیانگەڕاند یان لەسەر لاقە لاوازەکانی رایاندەگرت • چونکە راگرتنی منداڵی نەخۆشی وایان لە ناوجێگا بە باش‌تر دەزانی •

لەئەنجامدا منداڵەکە مرد • بەیانییێك هەڵسام و تەماشام‌کرد بە رووتی لەسەر زەویە بەردەڵانیەکە درێژ کراوە و بە عەباکەی دایکی داپۆشراوە • یەکێ بۆ کڕینی کفن بۆ بازاڕ تێرابوو و مەلایێکی پیر بۆ شۆرینی هات • ئەم مەلایە بە یاریەی برای ژنەکە لە گەرماو منداڵەکەی بە سابوون و ئاوی گەرم شۆری • منداڵەکە کوڕ بوو ، لەبەرئەوە دەبوایێ پیاو بیشوا ، بهاتایە کچ بوایێ ئەودەمە ژن دەیشۆری • بە هەردوکیان کفنیان کرد • خاڵەکەی هەڵی‌گرت و بۆ گۆڕستانی برد •

دایکەکە لەسەر بەردەکانی حەوشە بە عاجزی و کلۆلی دانیشتبوو • ئەو دایکە پانزە منداڵی بووبوو ، لەمانە ئەوا حەوتی مردن • لاقێکی خستبوە ژێری و ئەژنۆکەی‌تری بەرزکردبوو و قۆڵی پێوەگرتبوو و سەری بە مەلوولی بۆ کۆشی چەماندبوو • ئەوەندەی پێ‌نەچوو ژنانی دراوسێ بە هاژەوە هاتن و حەوشەکەیان پڕکرد • پرسە (واتا تەعزیە) سێ رۆژ دەوامی

---

(١) ئێستا ئەم بیرە چەوتە نەماوە . زۆر کچی نە هەژاریش دەبنە برین‌پێچ .
وەرگێڕ

کرد و بۆ هەفتەیێك گەرماوەکە دەبوو دابخرێ • بەڵام خێزانەکە یارمەتی منیان دا لە گەرماوەکە ئاوی سارد بەخۆما بکەم • لەپاش ڕۆیشتنی پیاوان دەرگاکەیان بۆ کردمەوە و ڕێیان پیشان‌دام • من حەزم نەکرد لەبەر دڵی ئەوان نەچمە ناو گەرماوەکە و خۆم بە ئاوی سارد نەشۆم •

لەپاش چەند ڕۆژێ لە ماڵەکەی بەرامبەرمان کچێکی بچووك هەر بەهۆی سك‌چوون وەك کوڕەکەی خۆمان مرد • ژنانی ئەو ماڵە بۆ ئاوبردن هورووژمیان هێنایە ماڵەکەمان ، چونکە لای ئێمە ئاوی پاکی بۆڕی هەبوو، ئەوان ئاوی جۆگەیان هەبوو کە لە چەند ماڵ تێیەڕ دەبوو و زۆر پاك نەبوو•

کە یەکەمین‌جار لە لادێوە هاتمە سولەیمانی ویستم بچمە لای پارێزگاری شار تاکو تەرجومانێکم بۆ بدۆزێتەوە • من لەو کۆڵانە تەسکە نزیك ئەو ماڵە بێ‌پەنجەرانە ئەوەندەی نەمابوو بزر ببم • لەپاشا پارێزگار تەرجومانێکی بۆ دۆزیمەوە کە ماڵەکەی لەو کۆڵانە تەسکە بوو •

ماڵەکەی بەرامبەر خانوویێکی گەورەی کۆن بوو و حەوشێکی گەورەی هەبوو • لە حەوشەکە چەند چەرپایەیێك بۆ نووستن دانرابوون • لەو ماڵە گەورە کۆنە چەند خێزانێك پێکەوە دەژیان و لە حەوشە ڕاستنەکراوەکە مریشك دەگەڕان • خانوەکەی خۆمانیش جاران هەموو قوڕ بوو ، بەڵام نیوەی بە خشتی سوور تازەکراوە و تەنیا نیوەی هێشتا دیواری خشتی کاڵی هەیە •

من لەگەڵ ژنانی ماڵمان ــ کە هەموو بە پەچە و عەبا خۆیان داپۆشیبوو ــ چووینە ماڵی ئەم دراوسێیە کە منداڵیان مردبوو • لێرە عەیبە بۆ ژنێك بە بێ‌پەچە و عەبا لە ماڵێکەوە بچێ بۆ ماڵێکی‌تری • بیستم پیاوی ماڵەکەمان حەزی نەدەکرد کچە سێزدە ساڵانەکەی ئیتر بە بێ‌پەچە و عەبا بگەڕێ و دەیگوت ئەو کچی عازەبە و شوورەییە بە بێ‌پەچە و عەبا بگەڕێ •

من لەچاو ژنانی سولەیمانی جلی زۆر سووکم لەبەرکردبوو ، لاق و قۆلەکانم رووت بوون • جلی ئافرەتی کورد لەوانەیە جوان و تازە بێ ، لە سیلك ، تافتە ، قەدیفە یان سورمە دروستکرابێ • لەوانەشە کۆن بێ و شەو و رۆژ بە بێ گۆڕین لەبەربکرێ •

چوونە ماڵەکەی بەرامبەر و لەوێ لە پشتخانێك سێ ئافرەت داپیرە ، دایك و پوور پێکەوە پشتیان لە دیوار کردبوو و دانیشتبوون و بە هاوار و فغانەوە دەگریان • منداڵە مردوەکە لە بەردەمیان داپۆشرابوو • دایکەکە لەگەڵ گریانەکەی دەیدا بە رانیا و دەیگوت : منداڵەکە پێش چەند رۆژێ چەند جوان و قەڵەو بوو • هەندێ جار ئاوازی گریانەکەی وەك گۆرانی بەرز و نزم دەبوو •

ئافرەتێکی کامڵ و قسە لەسەرخۆ لەپڕێکا هاتە ژوورەوە و بە قسەی باش و خۆش دڵی ئافرەتەکانی دایەوە • قوماشی کفنی هێنابوو ، لەتەنیشت منداڵەکە دانیشت و کفنەکەی بە باشی و پسپۆڕی نەختێ لە مردوەکە درێژتر بڕی • ئینجا مردوەکەیان بردە گەرماو و لەوێ بە سابوون و ئاوی گەرم سێ جار شۆردیان و خستیانە ناو کفنە سپیەکەوە •

باوك لە دەرگای حەوشەکەوە هاتە ژوورەوە ، منداڵە کفن کراوەکەی دوو جار هەڵگرت و داینایەوە • جاری سێیەم لەسەر قۆڵەکانی هەڵی گرت و بردیە مزگەوت و لەوێوە دەبێ بیبا بۆ گۆڕستان •

لەودەمە کە منداڵەکەیان دەشۆری لە حەوشەکە بۆ گرتنی کەڵەشێرێ کەوتنە قەڵەمباز و راکردن بۆ ئەوە کە سەری بڕن و سەرەکەی لەگەڵ تەرمی منداڵەکە بنێژن • لەوماڵە لە ماوەی دوو هەفتەدا دووکەس ئەمری خوایان کرد • ئەم قوربانیە بۆ لابردن و دوورخستنی کارەساتی تری بوو • وابزانم

ئەمە یەکێ لە رەوشتەکانی کوردە کە لەپێش ئیسلامەوە هێشتا لەناو خەڵك ماوە •

دواشت لەم رووداوە دیم لەشی کەڵەشێرە بێسەرەکە بوو کە بەدەست ژنێکەوە هەڵدەبەزی و لاقە فرتەی دەکرد وەکو هێشتا زیندوو بێ دەجووڵایەوە • ئەمە بەپێچەوانەی ئەو تەرمە بوو کە بە سپی پێچرابوو و پیاوەکە لەسەر قۆڵی هەڵی گرتبوو •



## - ٦ -

# مــار و دووپشك

من وێنەی فوتوگرافی ڕەنگاوڕەنگی هەندێ دووپشکی گەورەم دی کە لە سەفەری گردی شەمشارە گیرابوو • ئەم دووپشکانە سوور بوون و کلکە ژەهراویەکەیان بە بەرزکراوی دیـار بوو • لـەو گەشـتە مـار و کەمتیاریشیان دیبوو •

لە مالی دێنەکەم ئەم جۆرە جانەوەرانـەم هێشتـا نەدیبوو • تەنیـا ئێوارەیێکیان لە ئوتێلەکەی دووکان لەسەر سەرینە پاکەکەم دووپشکێکم دی ، هەر ئەنگوستێك درێژ دەبوو سپی و مەیـلەو سـوور بوو • لـە ڕۆبیانی [1] دەکرد کە کلکەکەی سەرپشتی خوار کردبێ • مـن توانـیم دووپشکەکە بخەمە ناو قاپێك و فڕێ‌ی‌دەمە ناو حەوزی توالێت و ئـاوی بەسەرا بکەم• کاربەدەستەکانی ئوتێل ڕۆژی دووەم هەموو خانوەکە گەران و

---

(١) ڕۆبیان جۆرە زیندەوەرێکی زەریایە کە توێکـلەکەی لێ‌دەکرێتـەوە و دەخورێ . لە بەصرە زۆرە .

متیلی نوێنەکانیان هەمــوو گۆڕی • لەگەڵ ئەوەشــدا هەمــوو دەرگا و پەنجەرەکان گیرابوون و تێلبەند کرابوون ، ئەو دووپشکە نازانم چــۆن گەیشتبوە سەر نوێنەکەی من !!

ئەمە یەکەم و دوا دووپشك بوو کە چاوم پێ‌کەوت ، بێتو هی‌تــری هەبێ من نەمبینی • بەڵام لەبابەت مارەوە بەسەرهاتم زیاترە • جارێکیــان مارێك دۆزرایەوە کە لە بن‌میچی ژوورەکەی لادێم بوو • ئەمە لە سەرەتای مانەوەم بوو لەماڵی شێخ لە پێش هاتنی تەرجومانەکەم • قسەی پێ‌نــاوێ بڵێم من نەمدەزانی لە بن‌میچی ژورەکەم مار هەیە • من لەسەر چوارپایەیێکی ئاسن دەنووستم کە بەتایبەتی بۆ من تەرخان‌کرابوو • هەموو ئێوارەیێ کــە خەبەرم دەدا دمەوێ بچم بۆ خەوتن هەردوو ژنە گەورەکانی ماڵەکە دایك و کچ ، هەردوو کچە بچووکەکان لەگەڵ کارەکەرەکە بە فانۆسێکەوە منیــان بۆ ژوورەکەم رەوانە دەکرد •

هەندێ‌جار پیاوێکیش لەگەڵیان دەهات ، مامەی منداڵەکان تاکو دڵنیا بێ‌پەنجەرە بەرزەکان ناجوولێن و ناکرێنەوە • کە دەستی لە پەنجەرەکان دا و قایمی کردن پێ‌ی‌گوتم Kissme واتا «مــاچم‌کە» ، مەبــەستیشی ئەوەبوو بــڵێ Excuseme واتا «لێم‌ببوورە» • پیاوەکانی کورد بە ئینگلیزیش قسە بکەن ئەدەبی خۆیان هەر دەپارێزن با بە ئینگلیزییێــکی شکاویش بێ • ئەم کۆمەڵە خەڵکە هەتا ژوورەکەم لەگەڵ مــن دەهــاتن ، جارێکیان کوڕێکشیان لەگەڵ هات کە دارتاش بوو لەو رۆژانــە لــەوێ کاری‌دەکرد • ئەمانە بۆ رەحەتی من بیریان لــە هەموو شــتێك دەکردەوە تەنانەت بۆ دەس‌شۆرینی بەیانی لەناو دۆڵکە ئاویشیان بۆ دەهێنام • لەپاش ئــەوە دەرگای ژوورەکەم و دەرگای حەوشــەکەیان بــاش دادەخست و دەرۆیشتن •

من هیچ جارێ لە ژوورەکەم ترسم نەبوو ، تەناتــەت پێش هــاتنی

تەرجومانەکەم کە دوو هەفتەی خایاند • جارێکیان دەمانچەیێکیان پێشاندام کە هی مالەکە بوو ، بەمەدا زانیم لێرە دەمانچە بەخۆرایی و هەر بۆ گالتـە بەکارناهێنرێ •

هیچ مێوانێکی نەویستراو نەهاتە لام ، جارێکیان نەبێ ، پاش نیوەڕۆ بوو و من بۆ نووستن درێژ بووبووم و پەنجەرەکان کە دەگەنـە خوارەوە لەپشت پەردەکان کرابوونەوە • لەپڕێکا دەستێك پەیدابوو و پاکەتێ پانی خستە بەینی شیشەکانی پەنجەرەکەوە • من دەستم لێدا و زانیم کتێبن و خراونەتە ناو بەرگی قوماشەوە • مەلایێـك لەوێوە تێپـەڕ بووبوو بـۆ حەسانەوە لە پشتخانەکە لای‌دابوو • وادیاربوو کتێبەکان هی ئەو بوون • من لەپاشان لەپاش ئەوە لەگەل سەرۆکی مالەکە نانی خوارد لەکاتی ڕۆیشتنی چاوم پێ‌کەوت •

بەیانییێکی زوو سەعات پێنج هەلسام و چوومە پشتخانەکە بۆئەوە کە لەپێش هەلسانی هەمووکەس و هەلهاتنی ڕۆژ تەماشای دیمـەنی دنیـەکە بکەم • لە بەردەم مالەکان ئاگر کرابوەوە و ژنان بۆ ئاوهێنان دەچوون • لەپڕێکا یەکێ دەیویست بە زۆر دەرگای پشتخانەکە بکاتەوە • من توانیم لەجێی خۆی رایگرم • بۆ من زۆر زوو بوو بۆ خێزانەکە هاوار بکەم ـ کە هێشتا لە مالەوە بوون و لەوانە بوو نووستبن ـ تاکو بێنە فریـام • وادیارە ئەو کەسە دەیویست بێتە پشتخانەکە و لەوێ چاوەڕێی هەلسـانی خەلکی مالەکە بکا • ئەمەش شتێکی خـراپ نەبوو • بەلام نەیـدەزانی لەودەمە من لەوێ مێوانم •

هەموو ئێوارەیێ کە منیـان دەهێنـایە ژوورەکەم لـەوێ لەسـەر چوارپایەکەم پالدەکەوتمو بە چرای Storch ی دەستم تەماشـای بن‌میچەکەم دەکرد • سەربـانە قوڕەکە زۆر ئەسـتوور و پتـەو بوو و نەیدەهێشت تینی گەرمای هاوین بگاتە ژوورەوە • بەهاران لە سەربانەکان

گیا دەڕوا ، لەپاشا وردە وردە زەرد و وشك دەبوو • لەم سەربانانە بانگردانی دار هەبوو کە پاش باران بۆ پەستانی قوڕی سەربان بەکار دەهێنرا • ئەم سەربانانە تەنیا بەرگەی ئاویان نەدەگرت •

بەهاران هەندێ ڕۆژ یەك دوو جار باران بە لێزمە و لەنگیزە دەباری و ژوورەکەم دلۆپەی دەکرد و قوڕاو بێجگە لە تاقەکان هەموو شتێکی تەڕ دەکرد • لە دیوارەکانی ژوورەکەم دوو ــ سێ تاق هەبوون و من هەموو شتێکی خۆم ، بەتایبەتی کامیرە و دەفتەرەکانم لەو تاقانە تاقەت دەکرد •

سەربانەکان هەرچەند بلێی ناڕێك بوون و تەماشاکردنی سەیر بوو ، چونکە دارڕێژەکان بە ناڕێکی دانرابوون و خرابوونە سەر کۆلەکەی ناڕێکی گێڕ •

بنمیچی ژوورەکەم کونی زۆر بوو ، لەوانەبوو ماریش لەو کونانەدا بژین ، بەلام من هیچم نەدی •

بەیانیێك لەگەل کابانی مالەکە بە ئیشارەت باسی مارەکردنم دەکرد کە لە دێنمارك هەندێ جار لە کەنیسە دەکرێ ، بەلام لێرە لەناو موسولمانەکان مارەکردن پەیوەندی لەگەل مزگەوت نیە • ڕاستت دەوێ من حەزمدەکرد لەپێش هاتنی تەرجومانەکەم نەختێ لەگەل کابانەکە بدوێم • ئەم قسەکردنە لە دەسکە گولێکەوە پەیدابوو لە شاخ کۆمکردبووەوە •

**بەتەنیا گەڕان لەناو دارستانەکەی پشت دێ**

ئەمە یەکەم و دواجار بوو بەتەنیا لە دێیەکەوە بڕۆم بۆ ناو دارستانەکەی پشتەوە و لەوێ نەختێ بگەڕێم • لە ڕێگا بە ڕێکەوت کەپرێکم دی کە هەندێ ژنی تێدا دانیشتبوون • ئەمانە دەسیان بۆ هەلتەکاندم تاکو بچمە لایان • منیش چووم بەلام بە دەس درێژکردن بۆ پارچە جلەکانم پەستیان کردم • من قسەکانیان تێنەگەیشتم و زوو بەجێمهێشتن و بۆ ناو شاخ

کەوتمە ڕێ . لەپاش ماوەیێك ئیتر حەزم کرد بگەڕێمەوە . لە گەڕانەوەم تەماشام‌کرد ئافرەتەکانی کەپرەکە هاتوونەتـە دەرەوە و بانـگم دەکەن . من گوێم نەدانێ و لەسەر ڕۆیشتن دەوامم کرد . ئینجا لەلایەن کۆمەڵێ کچی بچووکەوە دەورەدرام . من بە نیشانە تێم‌گەیاندن کە کوردی نـازانم و ڕۆیشتم . لەپڕێکا یەکێکیان بەردێکی تێ‌گرتم . من بە تیژی‌کەوتمەڕێ تاکو بێ‌راکردن لێیان دوورکەومەوە . پاش ماوەیێك لەتەنشت دوو کوڕەوە دەڕۆیشتم کە بە داس گیایان دەدووری . یەکێکیان بە داسەکەیەوە لێـم نزیك بوەوە و بە داسەکەی خەریك بوو بمترسێنێ . من تەنیا بووم و لـە ماڵی شێخ دوور بووم و کوردیم نەدەزانی ، لەبەرئەوە زۆر ترسام . بـەڵام رام‌نەکرد . بە پەنجەم نیشانەی ماڵی شێخم کرد و گوتم «ماڵی شێخ ، ماڵی شێخ» بەمە وازیان لێ هێنام و بە سەلامەتی گەیشتمە ماڵەوە . من لە تەمەنی خۆم ئەوەندەی ئەو ڕۆژە نەترسابووم . ئێستـاش کە ئەمـە دەنووسـم لەترسانا دەلەرزێم .

## مـــار

من گوڵەکانم پێشانی کابانی ماڵەکە دا و بەم‌بۆنەیەوە باسی مارەکردنی دێنمارکم بۆ کرد لەگەڵ دەسکەگوڵ کە لە کەنیسە دەکرێ . لەپڕێکا کچی ماڵەکە بە پەلەپەل هات و بەسەیرەوە باسی شتێکی دەکرد . ئێمە دەربەست بووین لەگەڵی بچینە پشتخانەکە . لەوێ هەندێ خەڵك دەورەی شێخیان دابوو ، کە خاکەنازێکی بە دەستەوە بوو و لەوێ زیندەوەرێکی درێژ لەسەر زەوی کەوتبوو کە یاردەیێ درێژ دەبوو . ئەمە مار بوو و ئەمە وشەیێکی تازەی کوردی بوو کە فێری بووم .

مارەکە خرایە چاڵێك و خەڵکەکە بڵاوەیان‌کرد . کە من زیاتر پرسیم زانیم کونی مارەکە لەوانەیە لە بن‌میچ بێ ، هاتوەتە خوارەوە بەڵکو بـۆ

ئاوخواردنەوە • لە دێنمارك مار کەمە و ئەمە یەکەمین جار بوو من ماری کێوی ببینم • شێخ بانگ دەکرێ و بە خاکەناز دەیکوژێ •

من ویستم بپرسم ئایا مارەکە ژەهردار بوو یان نا • بەڵام لەبەر کەمزانینی کوردیم نەمتوانی ئەمە بپرسم • ژنەکانیش پێم پێدەکەنین • لە دێنمارك ماری درێژی ناو گژوگیا هەیە کە ژەهردار نیە ، بەڵام ماری بچووك هەیە کە ژەهردارە •

وا دیار بوو ژنەکان تێنەگەیشتن من چی دەپرسم • وایاندەزانی من دەپرسم ئایا ئەم مارە کە بە مرۆڤیەوە دا دەمێنێ یان دەمرێ ؟ لەبەر ئەوە پێم پێدەکەنین • بەڵام زانیان من نەترساوم و شتەکانم کۆنەکردەوە لە ماڵەکە برۆم • ئەوان حەزیان دەکرد لەگەڵیان بمێنم ، من بۆ ئەوان شتێکی تازە بووم و ژیانیانی لە وەرس‌بوونی رۆژاو رۆژ دووردەخستەوە •

**رۆژی جیابوونەوەم لە ماڵەکەی تۆپزاوە :**

کە رۆژی جیابوونەوەم لە ماڵەکە هات بۆ دوعاخوازی چوومە لای ئافرەتەکان • ئەوان ملوانکەیێکی مێخەك و کووژەکەیێکی شینیان کردە ملم تاکو لێرەوە هەتا دێنمارك لە ملم بێ و کە بۆنی مێخەکەکە هاتە لووتم تۆپزاوەم بکەوێتە بیر • ئەم ملوانکەیەیان زۆر بە رێزگرتنەوە کردە ملم و زۆرم پێ ناخۆش بوو لەو دوو ئافرەتە چاکە جیابوومەوە کە دۆستایەتی‌یەکی زۆر گەرمیان بەرامبەرم نواند •

لەپاش گەیشتنی تەرجومانەکەم بیستم یەکێ لە سەرخەرمان مار پێوەی داوە • رەنجبەرەکەیان بە سواری بارگیر بردیە دووکان ، لەوێوە بە قەمەرە بردیە نەخۆشخانەی سولەیمانی • تەرجومانەکەم پێی‌گوتم ئەمە هەمان چەشنە مارە کە لە ژوورەکەم دۆزرایەوە و ژەهردارە •

لێرە پیاو و ژن بەهۆی داسێکی کورتەوە گەنم و جۆ دەدوورنەوە • هەندێ حەلقە دەخەنە دەستی چەپیان تاکو قەدی گوڵەکان بە باشی بگرن و بە داس کە بە دەستی ڕاستەوەیە ئەو بنجە گەنمە دەبڕن • لەپاشان ئـەم بنجانە لە جێگایێك کۆدەکەنەوە و بەهۆی مرۆڤ یان زیندەوەر دەیبەن بـۆ جێگای خەرمان بۆ کوتان • لەوێ بەهۆی گێرەی وڵاغ یان جەنجـەرەوە دەکوترێن واتا دەنکە دانەوێڵەکان لە پووشەکەی دەردەهێنرێن ، لەپاشان بەهۆی داری شەن خەرمانەکە شەن دەکرێ تاکو دەنکە گەنم یان جۆیەکان لە کاکە جیابکرێنەوە • ئەم گەنمە بەم جۆرە دەکوترێ پاك نیە و ئـاردەکەی بۆرە ، ژنان دەبێ بیشۆنەوە •

لەو ئاواییە کە دەژیام ئاردی بازاریـان بۆ نـان کردن نـەدەکڕی • دەیانگوت ئەو ئاردە بەکەڵکی نان نایێ • لەبەرئـەوە گەنمیـان دەکڕی • جارێکیان سێ بار گەنمیان بۆ هات کە بەسـەر سێ وڵاغەوە بوو کە لـە دێیێکی نزیك کڕابو و سێ کەس وڵاغەکانیان لێ دەخوڕی • وڵاغەکانیان هێنایە حەوشە و لەوێوە وەك مرۆڤ چوونە ژووری گەنجینە و لەوێ بارەکان داگیران • هەر بارێ بریتی بوو لە دوو جەواڵ کە لە موو دروست کرابوون و پێکەوە دوورابوون • گەنمەکە ڕۆکرایە سەر زەوییە ڕاستـە پـاکەکەی گەنجینەکە و تەپوتۆزی لێ هەڵسا • دوو قەنەپە خرانـە لای خوارەوەی بۆ پاراستن ، تاکو کەس نەچێتە ناوی و مریشك نەیخوا • گەنمەکە جێیێکی زۆری گرت و ژنان چەند ڕۆژێ خەریکی شۆرینی بوون هەروەکو لێـرە دەیگێرمەوە : یەکەم جار گەنمەکە لەسەر حەوزی ئاو بە بۆڕی ئاوی دەکەنە سەر و دەیشۆنەوە ، لەپاشان دەیبەنـە سەر بـان و لەسـەر بـەڕە بـۆ وشك بوونەوە ڕایدەخەن • ئینجا بۆ ئەوە کە تۆزەکەی نەمێنێ بە تەنـەکە لە سەربانەوە بۆ خوارەوە ڕۆی دەکەن • لەپاشان ژنێکی یەکچاویان هێنایە

لای گەنمەکە تاکو لە سەرەندی بدا • بەم جۆرە گەنمەکە لە پووش و بەرد پاكکرا و تەنیا دانەوێڵە زەردە جوانەکە مایەوە •

**مار پێوەدان و ڕووداوی‌تری**

جارێکیان ڕەنجبەرێك کە بە داس درەوی دەکرد مار پێوەی دا ، ئەو مارە کە وا دیارە لەناو پەلە گەنمەکە خۆی مات کردبوو • کابرایان ــ وەکوو لە ڕووداوەکەی پێشوو باس‌کرا ــ بە پشتی بارگیر بۆ دووکان برد و لەوێوە گەیاندیانە نەخۆشخانەی سولەیمانی •

لەپاشا کوڕێکم دی مار پێوەی دابوو • ئێمە بە پاسێکی بچووك لە هەڵەبجەوە دەچووین بۆ تەوێڵە • من لەگەڵ هاوڕێکەم لەپێشەوە لەتەنشت لێخوڕەکە (واتا ئاژۆرەکە) دانیشتبووین ، چونکە پێشەوە لەپشتەوە ڕەحەتتر بوو • پشتەوە زۆر تەسك بوو تۆ دەبوایێ کۆڵەکەی پاسەکە بە دەست بگری بۆئەوە کە هەڵنەتەکێ و ماندوو نەبی • هەندێ‌کەس لە تەنشتی دەرەوە راوەستابوون و هەندێکی‌تریش لە سەربانی پاسەکە دانیشتبوون • هێشتا دەشتە پانەکە تەواو نەبووبوو پاسەکە راوەستا • لەسەر زەوی شتێ درێژ بووبوو وامزانی کوڕێکە یان گوێرەکەیێکە لەبەر گەرما پەکی کەوتوە • بەڵام زەلام دەرچوو لەسەر زەوی لەژێر تینی هەتاوە گەرمەکە بێ‌دەنگ پاڵکەوتبوو • سەری ڕووت بوو خوێنی لێ دەهات • چەندکەسێ لە پاسەکە بازیان دایە دەرەوە و هەڵیان‌گرت • لەباتی ئەوە بە پاڵکەوتووی هەڵی‌گرن ، ویستیان لەسەر پێ رایگرن • بەمە ماندوو و نارەحەتیان کرد •

جارێکی‌تریش ئەم جۆرە کۆمەکی‌یەی نەخۆشێکم دی ، کە لەباتی ئەوە نەخۆشەکە بە پاڵکەوتووی هەڵگرن ، لەسەر پێ رایان‌گرت • جارێکی‌تری کچێکی بچووك لەناو قەمەرەیێکی کراوەی زۆر پڕەوە کەوتبوە

خوارەوە • ئەو دەمە جەژنەی قوربـان بوو • منـدالآن جـلی جـوان لەبەردەکەن و لە کەس و کاریان خەرجی وەردەگرن و لە بەیانی زووەوە هەتا ئێوارە بەناو بازاڕ و کۆلآنەکانا دەگەڕێن • دە ــ دوانـزە منداڵ بەجـارێ سواری قەمەرەیێکی بچووك دەبن و بـە ناوشـارا ــ وەك لـە جێـگای یاری کردنی ئەورووپا بن ــ هاتوچۆ دەکەن • یەکێ لە کچە بچووکەکان کە لەپشتەوە لەسەر کوشنەکە بەپێوە راوەستابوو کەوتە خوارەوە • من چاوم لێ بوو چـۆن سـێوێ دەکەوێتـە خوارەوە ، وا کچـەکە کەوت • زوو هەڵیان گرت و لەسەر پێ ڕایانوەستاند و هەڵیانتەکانـد تاکو بێتەوە هۆشی خۆی • کە هاتەوە هۆشی خۆی خستیانەوە ناو قەمەرەکە •

پیاوەکەی سەر ڕێگای تەوێلەش ــ وەکو ئەم کچە ــ ویستیان بـە پێوە رایگرن • لەپاشا خستیانە ئاو قەمەرەکە و لەبـاتی ئەوە راسـتەوخۆ بیبەن بۆ نەخۆشخانە بردیان بۆ دایرەی پۆلیس • کاربەدەستەکە نووستبووە هەڵسا و خۆی کۆکردەوە و ئەمری‌دا بیبەن بۆ شـوێنی رووداوەکە کـە پیاوەکەی لێ دۆزرابوەوە •

لە گەڕانەوە لە ماڵی خانەخوێی شەوی پێشوومان دابەزین ، تـاکو نەختێ ئاو بخۆینەوە و فێنکمان بێتەوە • خانووەکە لە قەراغ شـار بـوو ، بەڵام دڵمان بەوانە دەسووتا کە لەبەر هەتاو دەبێ چاوەڕێ بـکەن هەتـا نەخۆشەکە دەخرێتە نەخۆشخانە • تەرجومانەکەم زیاتر غەمی برا سـێنزە سالەکەی بوو کە لەناو پیاوەکان لەبەر تینی گەرما دەسووتا • لەپاشـان نەخۆشەکە لە نەخۆشخانە قەبووڵ کرا • وادیاربو لە سەربانی پاسێکی‌تری ــ بە بێ‌زانینی ڕێبوارەکان ــ کەوتبوە خوارەوە • ئێمە بەمجۆرە فرمانی خۆمان جێ‌بەجێ کرد • مایەوە برین‌پێچەکە تەماشای نەخۆشەکە بـکا و لەگەڵ پزیشك (واتا دکتۆر) پێکەوە تیماری بکەن •

ئێمە دووبارە بەرەو شاخ کەوتینەوە رێ • کە گەیشتینە شـاخەکان

ئیتر تینی گەرما شکا و لەژێر سێبەری دارەکان ئــاوی ســاردی پــاکی کانیەکان بەخورە خور دەرژایە خوارەوە • لەوێ لە چایخانەیێکی بچووك بۆ شکاندنی تونیەتیمان بە چای شیرینی سەنگین لامان‌دا • چایخانــەکە لەتەنیشت کانی و لەژێر سێبەری چەند دارێکی گەورە بوو • لەوێ بــۆ رێبوارێ کە لە گەرمیانی خوارەوە هاتبێ هەموو شتێك هەبوو دنیــای لێ بکاتە بەهەشت •

لەنــاو رێبوارەکان کچ و کورێك هەبوون : یەکێکیان ژنێکی تــازە مارەکراو بوو کە تەمەنی هەر دوانزە ســاڵ دەبوو • ئەم کچــە خەڵــکی هەرێمێکە دار تووی زۆرە [1] • لەوێ کچان و کوڕان بەهاران دەچنــە نــاو باغەکان بۆ کۆکردنی توو کە وشك‌دەکرێ و دەپەسترێتە نــاو پێستە یان دەکرێتە ناو کیسە و دەفرۆشرێ • لەکاتی توو کۆکردن باوك و دایــك ناتوانن کچەکانیان لەژێر چاوەدێری خۆیان بهێڵن ، لەبەرئــەوە زوو بــە بچووکی بە شوویان دەدەن •

کچە بچکۆلەکە برا دە ساڵانەکەی ــ کە مار پێوەی دابوو ــ لەگەڵ خۆی هێنابوو تاکو بۆ نەخۆشخانە بیبا • قــۆڵی تەواو بە هەنــدێ پەرۆ داپۆشرابوو •

لەپاشان لەگەڵ چەند ژنێ لە نەخۆشخانەکە لە هەڵەبجەوە چووینــە لای • لەوێش وەك لە سولەیمانی ژنان پەچەیــان دەپــۆشی و ژنــەکانی هاوڕێم بۆڵەبوڵیان دەکرد کە من خێرا دەڕۆم • من وەك ئەوان کراســی درێژم لەبەرنەکردبوو و لەباتی سۆل پێلاوم لە پێ بوو • لەبەرئەوە لەوان سەربەستتر بووم و خێراتر دەرۆیشتم • وابزانم ئافرەتە هاورێکانم لەبــەر

---

(١) وابزانم مەبەستی هەورامانە .

وەرگــێڕ

قورسی جلەکانیـان و درێژی کراسەکانیـان نەبـوو کە بـاش بەرێـوە نەدەڕۆیشتن ، بەڵکو لەبەرئەوە بوو کە ئێمە لە ناوەڕاستی شار بووین و دەبێ ئافرەتی پەچەدار بە سستی بڕوا و خۆی گران رابگرێ و لەسەرخـۆ پێش کەوێ .

کوڕە بچکۆلەکە خرابوە سەر چوارپایەیەیێـکی ئـاسن لە ژوورێکی گەورەی ناخۆش و شەربەیێك ئاو لەسەر مێزێ خرابوە تەنشتی . لـەوێ توانیان تیماری قۆلە ژەهراویەکەی بکەن ، کە لەپاش ٢٤ سەعات لە شاخەوە گەیشتبوە ئەوێ . قۆلی هێشتا پەنمابو و ژنان گوتیـان رەش و شـین داگیرسابوو . بەم جۆرە کوڕەکە لە مردن رزگار بو و کەوتە ژێر چاوەدێری پیاوێکی برین‌پێچ . من لە دلم نەدەهات تەماشای قۆلەکەی بکەم ، چونکە لەوڕۆژانە چەند ڕووداوێکی مار پێوەدانم دیبوو .



وێنەیێکی دەسکردی پێشخانێ لە تۆیزاوە

— ٧ —

# داپیرە تۆدەتەوێ ببیتە کاوبۆی

## چوون بو سەرگەلوو

ئەرێ ئەمەیە نالی ئەسپەکە کە دۆزیمەوە ! بەڵێ ئەمەیە • ئینجا دەهێڵی من بەسەرهاتی خۆم لە کاتی هاوین لە کوردستان بگێڕمەوە •

ئەم نالەم لە دەربەندەکە دۆزیەوە و ئەمە نالی هێسترە ، پێیان گوتم ئەم دۆزینەوەیە دەبێتە هۆی بەختی باش • کە دۆزیمەوە دڵنیا بووم بەختم باش دەبێ و لەباتی ئەوە بە سواری هێستر لە ڕێگا تەسکەکەی چەرمەبانی پشت پیرەمەگروون تێپەڕم ، ئەو ڕێگا تەسکە بە پێ دەبڕم •

بەیانیێکی زوو بوو و هاوڕێکانی کوردم و خۆم کاتێکی زۆرمان هەبوو • ئێمە لە دێی سەرگەلوو دەگەڕاینەوە کە کەوتوەتە ناو

شاخەکان • تەنیا ڕێگایێك ئەم دێیەی بە دنیای دەرەوە دەبەست ئــەویش ئەم ڕێگا تەسکەیە • ڕێبەرەکانمان ئەوەندە ئەقلیان هەبوو تێیان بگەیێنن لە هێسترەکان دابەزین و بە پێ ڕێگای خۆمان بە باشی بدۆزینەوە •

ڕێگاکە زۆر تەسك بوو ، لە بزنە ڕێیێك نەختێ پانتر بوو و پڕ بوو لە بەردی لەق • وا باشتر بوو تەماشای شیوە قوولەکەی خوارەوە نەکەی کە هەزار بە هەزار بوو • وا باشتر بوو بە پێ بڕۆی و تەنیا تەماشای بەری پێی خــۆت بکەی • بەڵێ سواربوونی هێستر لەپێشــدا ناخۆشــترە و گرانترە ، بەڵام لەپاشدا فێری دەبی • لەگەڵ ئەوەشدا هێستر ڕێــگای خۆی باش دەدۆزیتەوە و قاچی پشتەوەی لە شوێن پێی پێشەوەی دادەنێ، بەڵام کەسێ قاچی لەسەر بەردی لەق دانا ، لەوانەیە بخزێتە خوارەوە و بۆ تۆ وا باشترە تەماشای خوارەوە نەکەی •

ئێستا فێری ئەوە بووم سواری هێستر بم ، بەڵام هەستی ئەوەم دەکرد لە هەندێ شوێنی تەسك دەبێ بە پێ بڕوم • من لەپاشان پیاوێکم دی ــ کە کاربەدەستی میری بوو ــ بە هێستر و ئەسپ و ئۆتۆمۆبیل لە وڵاتەکە گەڕابوو • لە هەمان جێگا لە دەربەندەکە ــ کە من زانیم ڕێگاکە لە ڕێ ی هێستر تەسکترە و دابەزیم و بە پێ ڕۆیشتم ، ئەو دانەبەزی و ئەسپــەکەی خزایە خوارەوە • دارێك لە قەد شاخەکە خواو ڕاستان ڕزگاری کــرد • لەپاشا دەربەست بوو نرخی ئەسپەکە بیژێرێ •

**ســەرگەلوو**

لە تۆیژاوەی خۆم زۆر جار باسی ســەرگەلوو دەکرا کە لەپشــت شاخەکانە • کە ڕۆژی هاوین کێوەکانی دەسووتاند ، لەپێشا ڕەنگێــکی زەرد ، لەپاشا سپی و بۆری پێ دەدا ، لەژێر تینی هــاوینی بێڕەحــم کە چەمەکان یەك لەدوای یەك وشکیان دەکرد ، باسی سەرگەلوو خۆشتر و

جوانتر دەبوو • چەمێکی گەورە بەناو دێیەکەیا هاژەی دەهات و هیچ وشك نەدەبوو • سەرگەڵوو باغاتی هەیـە پڕ لە داری سـەوز کە تـۆ دەتوانی ماوەیێکی درێژ بەناویا بڕۆی و تەواو نەبێ • لەپاشا سەرگەڵوو بە سێبەر بوو • شاخە بەرزەکان دەورەی دۆڵەکەیان دابوو • لەبەرئەوە ڕۆژ لەسەر لووتکە بەرزەکان درەنگ هەڵدەهات و پاش نیوەڕۆ زوو لەپشت شاخـە بەرزەکان ئاوا دەبوو • تۆپزاوە ــ بەپێچەوانەی ئەمە ــ دەکەوتە پـاڵی جەنووبی ریزە شاخێك و بەیانی تا ئێوارە هەتاوی گەرم دەیسووتاند •

لە سەرگەڵوو سێبەر ، فێنکی و ئاوی سارد هەبوو کە بەناو دۆڵەکەدا خوڕەی دەهات • ئەم شتانە سەرگەڵوویان وەك بەهـەشت لێ دەکرد و مرۆڤیان لە خۆشی و کامەرانی نزیكدەکردەوە •

لەپاشا کابانی ماڵەکەی تۆپزاوەم لە سـەرگەڵوو لـە دایك بـوە و شێخەکانی سەرگەڵوو و تۆپزاوە براز و گەورەترین و دەوڵەمەندتریـن ماڵ لە سەرگەڵوو بۆ ئێمە کراوەتەوە • لەبەرئەوە دەبێ ئێمە بۆ ئـەوێ بـڕۆین • تەرجومانەکەم و من داوای ئیزنمان کرد کە کچە حەڤدە ساڵەکەی شێخیش لەگەڵمان بێت تاکو ماڵی منداڵیی دایکی ببینێ • بەڵام باوکی ئیزنی نەدا • بەمچەشنە کچانی جاهێڵ وا بەتوندی لەماڵی موسوڵمانان دەپارێزرێن• ئێمەی دوو ئافرەت کە نزیکەی مانگێ بوو لە تۆپزاوە لە مـاڵی شـێخ دەژیاین بەس نەبووین بۆئەوە بە سەلامەتی لەگەڵ خۆمانا بیبەین • سەرەڕای ئەمە ئێمە برای سێزدە ساڵانی تەرجومانەکەمـان لـەگەڵا بوو • شـێخ نەیهێشت کچەکەی لەگەڵمان بۆ سەرگەڵوو بچێت و ئێمە هیچمان پێ نەکرا• بڕیاری باوك لەم بابەتەوە هیچی لەگەڵا ناکرێ •

لەپێشا ویستمان هەر لە تۆپزاوەوە بە سواری بڕۆین ، بەڵام ئێمـە کە فێری سواری نەبووبووین ، نەمانوێرا هەشت سەعات لەسەر پشـتی

هێستر بە ڕێگاوە بین • لەبەرئەوە ئۆتۆمۆبیلێکمان هەتا شەدەلە بەکرێ گرت• سەفەرەکەمان سەعات و نیوێکی خایاند و نرخەکەی گران کەوتە سەرمان ، چونکە ڕێگاکە هەر بە ناو ڕێگا بوو • ئۆتۆمۆبیلەکە لەپێشدا بە ڕێگایێکی خراپدا هاتە خوارەوە هەتا چەمێکی وشک و لەوێوە سەرکەوت و بە ڕێگایێکی زۆر بەردەڵانیا ئێمەی بە سەلامەتی گەیاندە خانوویێکی ناوباغ • لەوێ ئێمەی بەجێهێشت و بەڵێنی پێداین کە دوو ڕۆژیتری بێتە دوامان و بمانباتەوە بۆ تۆپزاوە •

لەناو باغەکە لەسەر فەرش و دۆشەگ لەژێر سیبەری داری سەوز و نزیك حەوزێ دانیشتین • دێیە گەرمەکەم نزیك دوو هەزار پێ لەسەر ڕووی زەریایە • ئێرە زۆر بەرزتر بوو • لەپاشان ئاو فرەتر و دار مێوەیێکی زۆر هەبوون و دنیا سەوز بوو •

ژنانی ماڵەکە ئاو و چای و میوەیان بۆ هێناین • لەسەر حەوزەکە ژنێك بە چیچکانەوە دانیشتبوو مریشکێکی ئامادە دەکرد • جارێکیتری من بە چاوێکی خۆشی و باشی تەماشای ژنەکەم دەکرد چۆن بە ئاسانی و پاك و تەمیزی دانیشتبوو مریشکەکەی دەشوریەوە و پارچە پارچەی دەکرد، دیسان دەیشۆریەوە و دەیخستە ناو دەفرێك • ژنەکە بە کراسە درێژەکەیەوە ، نە لە گۆشتەکە پیس بوو و نەش لە شۆرینەکە تەڕ بوو • لە بن دیوارێ لە تەنشت حەوزەکە کابرایێکی درێژی لاواز دانیشتبوو مێزەری بەسەرەوە بوو کەوای لەبەردا بوو ، وەك کوردەکان شەرواڵی لە پێ نەبوو • تەمەنی حەفتا ساڵ دەبوو • چاوەکانی لەژێر مێزەرەکەیەوە بە بێمەبەست بزەیان دەهات و تەماشای دەکرد • لەپاشان بە تەرجومانەکەمی گوت نۆزدە ژنی مارە کردوە • کە گوێم لەمە بوو کوتوپڕ بیرم گۆڕی و لە دڵی خۆما گوتم وادیارە بەخۆڕایی و بە بێئامانج (واتا هەدەف) تەماشا ناکا • ژنەکانی دەبێ ئێستا مردبن یان لەگەڵ خشڵ و هەموو شتەکانیان بۆ ماڵی باوکیان نێررابن •

لەودەمە تەنیا یەك ژنی هەبوو ، بەڵام وادیارەماڵە گەورەکەی پڕە لە منداڵ و نەوە • منداڵێك لەوێ بوو لەناو لانکە کە تەمەنی هەفتەیێك بوو • بەرگی سووریان لەبەر کردبوو و قوماشێکی رەشیان بەسەر لانکەکەیا دابوو تاکو لە تیشکی رۆژ بیپارێزن • دایکەکەی لاواز دیار بوو و شیری زۆری نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە ئیش و کاری ماڵ بەشداری دەکرد •

ئیمە درەنگمان لێ هاتبوو و سەعات پاش پێنجی ئێوارە بوو • گوتیان سەفەر بەسەر شاخەکەدا بۆ ئەودیو هیچ نەبێ دوو سەعـات دەخـایێنێ • لەودەمە کە چاوەڕێی سواربوون بووین من چوومە ناو دارەکان و لەوێ تەنوورەکەم گۆڕی و پانتۆڵێکی شینی کەتانم لە پێ کرد ، ئەو پانتۆڵە کە لەگەڵ خۆم هێنابووم •

کاشکی ئەمەم نەکردایێ !! چونکە بوە هۆی بەرپاکردنی هەڵـلا و قسە و رەخنەی بێدەنگ • ئەمە سەیر نیە • لێرە ئافرەتان شەرواڵی درێژی رەنگاورەنگ لە پێ دەکەن کە دەگاتە قولەپێیان ، کە لەژێر کراسەکانیانەوە دیارە و کە دادەنیشن دەردەکەوێ و دیاربوونی لایان ناشیرین نیە • بـەڵام من ئافرەتێك بووم لەناو ژنانی ئێرە دەژیـام ، دەبوایێ وەکو ئەوان خۆم بپۆشم و هەرچۆنێ بێ نەدەبوو پانتۆڵ لە پێ کەم کە پارچە جلێکی پیاوانە بووە تەرجومانەکەم شەرواڵی درێژ ، کراسی درێژ و سوخمەی لەبەر کردبو و پێلاوێکی لە پێ بوو کە بەرز نەبوو • هەمووکەسێ ئەم جلەی بۆ گەڕان لـە کوردستان بە بەرگێکی باش دادەنا • لەپاش قەدەرێ وڵاغەکان گەیشتن تەنیا هینەکەی من هێستر بوو ئەودوایی گوێدرێژ بوون • راستیتان پـێ بڵێم بێتو لە منیان بپرسیایێ من گوێدرێژم بۆ سواربوون هەڵدەبژارد ، چونکە لەزەویەوە نزیکتر و خەتەری کەمترە • داخەکەم بۆ من هێسترێکی وایان هەڵبژاردبوو کە وەك ئەسپەکەی باوکی کەلەگەت بوو •

دو رێبەرمان لەگەڵ بوون : یەکێکیان بە پەتێك سەری هێسترەکەمی

رادەکێشا و ئەوی‌تری چاوی لە کەرەکان بوو • هێسترەکەی مـن زینی نەبوو ، بەڵکو کورتانێکی پانی زبر کە بە شـلی بەژێر زگی هێسترەکەوە بەسترابوو •

من لە رابوردووی دوور فێری سواری بووبووم ، بەڵام بۆ ماوەیێکی کورت سوار بووم و سواری ئەسپی بە زین و لغاو بووم •

هەروەکو گوتم لە منیان بپرسیایێ بۆ سواربوون گوێدرێـژم بـە باشتر دەزانی • بەڵام ئەوان هەر بۆ راگرتنی قـەدر و رێـز و دڵی مـن هێستریان بۆ هێنابووم • پێیان شوورەیی بوو من سـواری کەر بـم • هەرچۆنێ بێ سوار بووین • من کامێرەکەم پێ بوو و بە سواری نەدەکرایەوە، چاویلکەییکی هەتاویشم پێ بوو بۆ هێمن‌کردنی تینی هەتـاو و خستـە سەرچاوم • تەرجومانەکەم بە جلە جوانەکانیەوە سواری کەرەکە بوو و عەباکەشی خستبوە بەردەمی ، بۆئەوە کە لەوێ دابەزی لەبەری‌کات •

لە سەرەتادا بە رێگاییێکی بەردەڵانیا رۆیشتین و لە هەندێ شیـوی وشك تێپەڕین کە زستانان و بەهاران ئاوی پێدا دەڕوا •

ئێمە لە دەربەندێکەوە تێپەڕدەبووین کە وردە وردە بەرز دەبوو • پیرەمەگروون و شاخەکانی دراوسێی کەوتبوونە پشتمانەوە ، لەپێشمـان ئەو ریزە چیایە هەبوو کە دەبێ بەسەر دەربەندەکەیا بڕۆین • رۆژی پـاش نیوەڕۆ تیشکە درێژەکانی بە نەرمی بۆ دەربەندەکە فڕێدەدا • دیمەنـەکە زۆر جوان و قەشەنگ بوو ، رۆژ لە رۆژئاوامـان وردە وردە بۆ سـەر شاخەکان نزم دەبووەوە •

لەپاشان سەرکەوتن دەستی پێ کرد • هێسترەکەم بەرەو دەربەندەکە لە ئاسۆ بەسەر پشتە تەسکەکەی شاخەکە بۆپێشەوە ملی دەنا • ئەودەمـە قسەکانی نەوەکەم لە دێنمارك هاتە بیرم • ئەم نەوەیەم بیستبووی من بـۆ

لێکۆڵینەوەیێکی ئێتنۆلوجی Ethnology (واتا خەڵكناسی) بـۆ کوردستان دەچم • بە ئەقڵە پێنج ساڵانەکەی دەیویست تێبگا من دەمەوێ لەوێ چیبکەم • وادیاربوو رۆژێ لە رۆژان ئامانجەکەمی دۆزیەوە و بـە دەنگە شیرینـە گڕەکەی گوتی : « داپـیرە ، ئەوە تـۆ دەتـەوێ ببیتـە کاوبۆی [١] » •

چەند حەزم دەکرد منی لەسەر ئەم هێسترە ببینیایێ چـۆن بەسـەر قەدی شاخەکە دەڕوا • بەڵام من لەپڕێکا نەوە پرچ زێڕینەکەم لەبیرچوەوە چونکە هێسترەکەم بەرەو ئاسـۆ نەدەڕۆیی ، لەژێرم هەندێجـار خوار دەبوەوە و هەستمدەکرد کورتانەکەی ژێرم زۆر توند و قایم نیە • رێگاکە وەك بزنەرێ تەسك بووبوو و بۆ راست و چەپ پێچی دەکرد • لە هەندێ جێگا رێگاکە زۆر تەسك دەبوو : لە لای راست قەدی شاخ نەدەما و لەلای چەپ شاخەکە بە ستوونی (واتا عەموودی) وەك تاشە بەردێـك بۆنـاو شیوێکی هەزار بە هەزار دەهاتە خوارەوە • من بەترسەوە تەماشای ئـەو پەتەم دەکرد کە بە دەسـت رێبەرەکەوە بوو کە بە کلاشـە نەرمەکەیـەوە لەسەرخۆ و بە دلنیایی پێشدەکەوت • بێتو پێی هێسترەکەم لەسەر بەردە لەقەکان بخلیسکێ ئەو پەتە چارەم ناکا • من بە دەستی چەپم لای پێشەوەی کورتانەکە و بە دەستی راستم لای پشتەوەیم توند گرت و لابەلا لەسەر هێسترەکە بە ناخۆشی خۆم رادەگرت • لەپڕێکا گوێم لە دەنگی دڵسـۆزانە و غەمخۆرانەی تەرجومانەکەم بوو کە هاواری کرد : «مادام هێنی ئاگات لە خۆت بێ» بەڵام لەبەر پێچاوپیچی شاخەکە من چاوم لێ نەبوو • لەئەنجامدا

---

(١) کاوبـۆی Cowboy گاوانی سواری ئەمەریکایە کە لە سـەدەی نۆزدەمین ناوێکی سەیری پەیداکرد و ئێستا ، بەتایبەتی لە سینەمـا و کتێبی منداڵ و هەرزەکاران ، بوەتـە نیشـانە بـۆ مرۆڤی چـالاك و خۆپێشاندەر •

وەرگـێڕ

گەیشتینە تەوقەسەری دەربەندەکە و لەوێوە چاومان لە شیوە قوولەکەی ئەودیو بوو . ڕێبەرەکانمان لەدوورەوە لە قوولایی خوارەوە سەرگەلوویان پیشاندایین . ئێوارە درەنگ بوو ، نەختێکیش تاریك بوو ، لەبەرئەوە نەمانتوانی گوندەکە دیاری بکەین و لەو جێگا ناخۆشە و لەژێر زەبری مەترسی دەربەندەکە غەمی ئەوەمان نەبوو ئاستی گوندەکە ببینین .

ئینجا دابەزینی سەربەرەوخوار دەستیپێکرد . ئەمە لە سەرکەوتن هەزار جار خراپتر بوو . کە هێسترەکە بەرەوژوور ملی دەنا ئاسانبوو بۆ تۆ خۆت بە کورتانەکەوە بگری . بەلام لە ڕێگا پێچاوپێچەکەی سەربەرەوخوار کورتانەکە بۆپێشەوە دەخلیسکا و لەوانەبوو تۆ بەسەر ملی هێسترەکەدا بخزێی و بکەویە خوارەوە ، لەبەرئەوە هەزار جار ناخۆشتر بوو .

ڕێبەرەکانمان پێیانگوتووین ڕێگاکە دوو سەعات دەخایێنێ ، بەلام چوار سەعاتی پێچوو . تاریکی هەموولایێکی لە زووەکەوە داپۆشیبوو . لە نزیك دێ کەوتینە ناو مێگەلەکان . مەڕ و بزن لە هەموولایێکەوە دەورەیاندایین و لەناو زەریایێکی گەرمی ڕەش و بۆر بەرەو سەرگەلوو ملماندەنا .

ڕێگاکان وەك جۆگەی ڕەش بەناو مالەکانا پێچیان دەخوارد ، ئەو مالانە کە یەك لەدوای یەك بە چەند چین لەپال شاخەکە دروستکرابوون . گوندەکە باغی زۆر بوو و خوڕەی ئاو بە دەنگێکی شیرین و خۆش دەگەیشتە گوێمان . لەپاشان لە دەرگایێکی داری گەورەوە تێپەڕین و گەیشتینە حەوشەی تەختنەکراوی لێژی مالی شێخ ، ئەو مالە کە دوو شەوی هاتوو تێدا دەمێنین .

**گەیشتن بە سەرگەلوو**

کە دابەزیم ناو لاقم لەبەر سواریە ناخۆشەکە دەیێشا ، کە دەڕۆیشتم

ئەژنۆم و لەبەر گرتنی کورتانەکە هەردوو باڵەکانم دەیێشان • غەمی گەڕانەوە بەو ڕێگا ناخۆشەدا هەستی ڕابواردن و مانەوەمی لە سەرگەڵوو ناخۆش‌کرد • من بیری ئەوەم نەدەکردەوە لە گەڕانەوە دەتوانین بە کۆمەکی ڕێبەری باشتر و وڵاغی زیندار بە چەشنێکی خۆشتر سەفەر دەکەین • ئەوەشم نەدەزانی پێش گەیشتن بە دەربەندەکە دەبێ لە وڵاغ دابەزین و بە پێ بڕۆین • ڕێبەرەکانمان ــ لەبەر درەنگی ــ پێیان‌نەوتین لە دەربەندەکە دەبێ دابەزین • ئەم ڕێبەرانە لە سەرەتادا وایان بە باشتر دەزانی سەفەرەکە بخەینە بەیانی • چونکە نە سوار و نە کاروان ــ نەك تووشی ڕووداوێکی خراپ بن ــ بە تاریکی بەسەر ئەو دەربەندە دوورە ناخۆشەدا تێپەڕ نابن کە جێگای وەستانی نیە • ئێمە لە کاتی هاتنمان کە درەنگ بوو تووشی کەس نەبووین • بەڵام لە گەڕانەوەمان ــ کە بەرەو بەیان بوو ــ تووشی چەند کەسێ بووین کە لەگەڵ هێستری بارکراودا بەرەو شەدەڵە دەڕۆیشتن • یەکێ لە بووکەکانی شێخ ــ کە لە ماڵی بووین ــ ساڵی پێشوو زۆر بە ناخۆشی لەو دەربەندەوە تێپەڕ بووبوو • ئافرەتەکە منداڵی لەبارچووبوو ، لە سەرگەڵوش نەخۆشخانە نەبوو ، تەنیا پسپۆڕێکی لەش‌ساغی هەبوو کە تەماشای نەخۆشی سەرپێیی دەکرد و دەرمانی پێ‌دەدان • ئافرەتەکە زۆر نەخۆش دەبێ • بە پشتی هێستر لەو دەربەندەوە تێپەڕ دەکرێ و لەپاش هەشت سەعاتی‌تریش دەگەیێنرێتە سەر ڕێگای ئۆتۆمۆبیل ، لەوێوە بە قەمەرە دەبرێتە شاری کەرکوك و لەوێ چوار مانگ لەلایەن پزیشکەوە تیمار دەکرێ • لەپاش چاكبوونەوەی دەگەڕێتەوە و بەسەر هەمان دەربەندا بە پشتی وڵاغ دێتەوە سەرگەڵوو • کە تەماشامان دەکرد هێشتا سیس و لاواز دیار بوو • لە بەردەممان لەسەر سینی‌یێکی مسی گەورە جغارەی تێ‌دەکرد • لێرە زۆربەی لادێیی‌یەکان لە شار قاقەزە جغەرە دەکڕن و لەلای خۆیان بە تووتنی وردی وشك پڕی دەکەن • تووتنی

ئەم جغەرانە وەك جغەرەی پـاکەت کە بە مەکینـە دروسـت دەکریّ زۆر نەپەستراوە ، لەبەرئەوە کە کێشرا زووتر تەواو دەبێ • کە تەماشای رەنگی زەرد و دەستە سپیەکانی ئـافرەتەکەم کرد مووچرکم پیـا دەهـات لـەوە کە مرۆڤ لێرە نەخۆش کەویّ و بە پشتی ولاغ هەشت سەعات ، لەپاشـان بە ئۆتۆمۆبیل چوار سەعات بەرێـوەبێ بۆئـەوە کە بگاتـە نزیـکترین نەخۆشخانە •

مالەکەی شێخ زۆر گەورە بوو ، بەهۆی پێپلکەیێکی زۆر بـەرز و ناخۆش تۆ دەگەیشتیە پێشخان کە لەپشتیەوە چەند ژووریّ هەبوون • لـە هەندیّ ژوورەکان بۆ چێشت‌لێنـان ئـاگردان هەبـوو کە لـە خشـت دروست‌کرابو • یەکێ لە ژوورەکان بە بەڕە و فەرش داپۆشرابوو ، چەنـد تاقێکی هەبوو و لە ناوەڕاستی لە دیوارێکەوە بۆ دیوارەکەی بەرامبەری بۆ جل و شت هەلخستن پەتێك قایم کرابوو • لە پێشخانەوە بە پێپلـکە تۆ دەگەیتە سەربانێکی تەخت کە بۆ نووستنی هاوین دەستی‌دەدا • لـە تەنشت خانوەکە و لەپشت دیوارێکەوە بۆ چێشت‌لێنانی دەرەوە ئـاگردان هەبوو • ئەو ئێوارەیە کە گەیشتین مەنجەلێکی مسی گەورە خرابوە سەر ئاگردانەکە و برنجی تێدا لێ‌دەنرا • ئافرەتێـك لەتەنشتیـەوە چیچـکەی کردبوو و بە کەوچك خەریکی تێك‌دانی برنجەکە بوو • لەپاش پێ‌گەیشتن ئەم پلاوە بە قاپی پان بۆ مێوانەکان و کۆمەلانی‌تری مـالّ دەبرا • هەمـوو جاریّ چێشت‌لێنەرەکە بە دەستی کۆمەلە برنجەکەی ناو قاپەکەی جـوان رێك دەخست • ئێمە لەسەر دۆشەگ دانیشتین : من بە جلە نـاراستەکەم و تەرجومانەکەم بە عەبا رەشەکەیەوە کە بەخۆیەوە پێچابووی • ئەو لە رێـگا لەپێش گەیشتنمان عەباکەی کردەوە و لەبەری کرد •

**بەدینی کوردەکان**

کەیبانوە جوانەکەی مالّ زۆر بەدین بوو • لە مەلا بانگدانەوە هەتـا

ڕۆژئاوا بەرۆژوو بوو • ئەو لەبەر رەمەزان رۆژووی نەگرتبوو ، ئەو رۆژوە کە لەسەر هەموو کەسێ فەرزە ، بەڵکو بۆ خۆی رۆژووی دەگرت تاکو مەرامێکی بێتەجێ • مەرامەکەشی ئەوەبوو یەکێ لە خزمەکانی بۆ حەج بچێ • بەڵێ لەپاش ئەوە باش نانتخوارد ، دەتوانی هەتا ئێوارە جغەرە نەکێشێ • بەڵام ئاو یان شلەمەنی وەك چای و ماستاو نەخواردنەوە وابزانم زۆر گرانە • تۆ لەم گەرمای هاوینە کە پلەی گەرمی هەندێجار دەگاتە ١٢٠ (ی فەهرەنهایت ، نزیك پەنجای سەدی) زۆر سەخت و ناخۆشە بەرگەی تونیەتی بگری • تۆ لەم ئاو و هەوا گەرم و وشکە زۆر پێویستت بە شلەمەنی هەیە • بەغدا کە لە خوار سەرگەلوو و سولەیمانیەوەیە زۆر گەرم و وشکە • بەڵام بەهۆی خواردنەوەوە توانیم لەوێ بەرگەی گەرما بگرم •

دینی ئیسلام کارێکی زۆر گەورەی کردوە لەسەر ژیانی موسڵمانان • لەپێش ئەوە بچم بۆ کوردستان نەمدەزانی دینی ئیسلام هەتا چپایەیێك کاری (تینی) لەسەر ژیانی موسوڵمانان کردوە و چۆن ئەم موسوڵمانانە هەموو رۆژێ پێنج جار نوێژ دەکەن ، رەمەزان رۆژوو دەگرن ، زەکات دەدەن و پێیان کرا بۆ حەج دەچن •

لەم ماڵە دایك و کچ رۆژی پێنج جار بەرماڵەکەیان رادەخەن ، سەریان دەپێچنەوە ، پێیان لەژێر کراسەکەیان دەشارنەوە و بە بێدەنگی و لەسەرخۆ نوێژی خۆیان دەکەن • لە دەمی نوێژکردن ئاگایان لە دنیا دەبڕێ • کوڕەکەی لەبەر چرای فوتیلە نەوتەکە تەراش دەبوو ، رادیۆ بە هێواشی گۆرانی دەچڕی ، چای دەخورایەوە و دەنگی کەوچکی چای لەناو ئیستیکانەکە دەهات ، بەڵام نوێژکەر لەسەر نوێژەکەی خۆی دەوامی دەکرد و لەناو گوتنی ئایەت و دوعاکانی نوێژ نوقوم بوو بوو •

جارێکیان کە کەیبانو بەرماڵەکەی داخست و دەستیکردە نوێژکردن ، لەپشتیەوە دوو منداڵی حەوت و هەشت ساڵان لەسەر چەقۆ بۆ پاككردنی

خەیار لێیان بوە شەڕ • لەتەنشتیانەوە سەماوەرێکی پڕ ئاگر و ئاوی گەرم هەبوو• من ترسام لەوە کە منداڵەکان بکەونە سەر سەماوەرەکە و کارەساتێ بەرپابکەن • بەڵام ئافرەتەکە لەسەر نوێژەکەی دەوامی کرد هەتا سەلامی دایەوە • ئینجا لە منداڵەکانی بەتوندی خوڕی و شەڕەکەیانی ڕاگرت •

لە تۆپزاوەش جارێکیان شێخ لە ماڵ بوو هەندێ پیاو و ژن لە ماڵەکەی چاییان دەخواردەوە و پێکەوە قسەیان دەکرد • لێرە لە لادێ ژنان دەتوانن لەگەڵ پیاوان قسە بکەن • لەپڕێکا سەرۆکی ماڵ ، شێخ هەڵسا و پێڵاوەکانی داکەند ، چوە ژوورەوە بەرماڵەکەی هێنا و رایخست و دەستی‌کردە نوێژکردن • لەپاش نوێژەکەی هاتەوە سەر کورسیەکەی و بە چوار مەشقی دانیشت ، مشکیەکەی لەسەرکردەوە و جغارەیێکی داگیرساند و دەستی‌کردە چای خواردنەوە و قسەکردن •

**وەك بوودا لەسەر کورسی و قەنەپە دانیشتن**

ئەو ئێوارەیە کە گەیشتینە سەرگەلوو زۆری کورسی و قەنەپەکان لە ژوورەکان دەرکرابوون و خرابوونە دەرەوە • لە سەربان تەختێکی زلی ناڕێك هەبوو بۆ نووستن دانرابوو • بەڵام پێش نووستن هەندێ پیاو بە چوار مەشقی لەسەری دانیشتبوون ، واتا لاقیان خستبوە ژێر خۆیان • پیاوەکان زۆر جار بەمچەشنە لەسەر کورسی و قەنەپەکان دادەنیشن و بەمە سەردوشەگەکانیان بەپێی رووتیان پیس و لەکەدار دەکەن • من بە سەیرەوە تەماشای ئەم کوردانەم دەکرد کە چۆن بە چوارمەشقی لەسەر قەنەپە و کورسیەکان دادەنیشن ، واتا وەك بووداکان [1] لاقیان‌دەخەنە ژێر خۆیان ، نەك وەك ئێمە کە لاقمان بۆ خوارەوە شۆڕدەکەدەینەوە •

---

(١) لە وێنە بەردینەکانی بوودا لە باشووری رۆژهەڵاتی ئاسیا و ( لە تایلەند ، ڤیەتنام ، بۆرمە و سیلۆن ) پەیکەری بوودا بە چوارمەشقی لە بەرد داتاشراوە .

**وەرگێڕ**

ئەو سەربانە لە سەرگەڵوو کە دەبوایێ بنوین ، بە دار و گەڵاو حەسیر بۆ جیاکردنەوەی ماڵەکان پەرژین کرابوو • هەندێجار ماڵەکانی ئەودیـو بۆ لای ئێمە دەهاتـن یان بەسـەر ئێمـەدا بۆ پشـت پەرژینی خۆیـان دەڕۆیشتن • منداڵان لە سەربانەکە لەلایێکەوە بۆ لایێکیتری رایاندەکرد و دەگەڕان • کە خەویان دەهات لەسەر دۆشەگێ دەنووستن ، یان رایاندەکردە باوەشی دایکیان و لەوێ خەویان لێ دەکەوت • دۆشەگەکان لەسەر بەڕە لە تەنیشت پەرژینەکە راخرابـوون • ئەندامـەکانی خێزانـەکە لەسـەر دۆشەگەکان دانیشتبوون و خەریکی دەمەتەقێ بوون •

دوو شەو لەوێ ماینەوە • بە رۆژ بۆ ناودێ و بـاغەکان بـۆ گەڕان دەچووین • ئاوی چەمەکە خوڕەی دەهات و وەکو بۆیان گێراینەوە سارد و خۆش بوو • بۆ ماوەیێکی درێژ بەناو باغەکانا رۆیشتین کە کێڵرابـوون ، پاککرابوون و دار و سەوزەی لێ روابوو • تۆ تووشی هەستێکی دڵکێش و دڵکراوە دەبووی کە لەپاش تۆپزاوەی وشك و بۆر و بێدەنگ لێرە خۆت لەناو دارستان ، باغ و سەوزایی دەدی و گوێت لە خوڕەی ئاو دەبـوو •

بەڵام لە لایێکیترەوە من حەزم لە سەرگەڵوو نەدەکرد کە شاخی بەرز دەورەیدابوو و دیمەنەکەی دڵئارا و دڵکێش نەبوو ، بەڵکو نەختێ تەنـگ بوو •

بەگوێما چپاندیان کە سەرگەڵوو لە دەمی خۆی نـاوچەی حەقـەکان بوە • بەڵام ئەو حەقانە کێن ؟ خەڵکی دەرەوە کەمیان لێ دەزانن • خەڵکەکە بە ترس و ریزەوە باسیاندەکرد • بێتو کۆمەڵێکی پڕنهێنی بیانەوێ بـۆ خۆیان ناوچەیێك پەیداکەن ، لە سەرگەڵوو باشتریان بۆ نادۆزرێتـەوە • لەپاشا بۆیان گێرامەوە لەناو شاخەکان ئەشکەوتێ هەیە ساڵی ١٩٢٠ شێخ مەحموودی سولەیمانی پەنای پێ برد •

بەڵێ سەرگەلوو بۆ من جێگایێکی سەیر ، کێوی و دڵگیر بوو • بەڵام کە گەڕاینەوە تۆپزاوەی وشك و بۆر من نەمدەتوانی لە دڵی خۆمـا وابلێم • بۆ ئەو خێزانە کە لەگەڵیا ژیام سەرگەلوو بەهەشت بوو •

### گەڕانەوە لـە سەرگەلوو

من جارێکیتری سواری وڵاغ بووم ، ئەمجارە سواری ئەسپێـکی جوان بووم : لاقەکانی جوان ، کلکی درێژ و کەللەی زۆر جـوان بوو • مووروویی شین بۆ چاوەزار کرابوە ملی و زینێکی جـوانی نەخشکراوی هەبوو • من ئەو دەمە تێگەیشتم بۆچی زینی پایسکیلەکان نەخشکراون • تومەز خاوەنەکانیان لاسایی زینی ئەسپ دەکەنەوە • زۆری هەرزەکارەکان لە سولەیمانی پایسکیلیان هەیە و تەنانـەت بۆ سینەمـاش دەیانهـێنن و لەپێشەوە لای شانۆکە رایان دەگرن •

من پاڵەوان نیم سواری ئەسپ بم ، لەبەرئەوە لغاوەکەم دایـە دەس رێبەرێك کە ئەسپەکەی رادەکێشا • من حەزم دەکرد بەسەر شاخەکانا بـە سواری بڕۆم و لە سەرەوە چاوم لە دیمەنی جوانی وڵاتەکە بێ • بەڵام زانیم ئەمەم پێ ناکرێ و ئەسپەکە لەوانەیە دەسبکاتە چوار ناڵە و من تووشـی ناخۆشییێك بکا و بمداتە زەویا • من بۆ ئێرە بۆ گەڕان نەهاتبووم ، بەڵکو بۆ تۆژینەوەیێکی (واتا لێکۆڵینەوەیێکی) زانیاری هاتبووم • لەبـەر ئەوە وام بە باشتر زانی لغـاوەکە بەدەس خۆمـەوە نـەگرم و بیدەمـە دەس رێبەرەکەم • تەرجومانەکەمیش سوار بوو و لغاوی بەدەسەوە بوو • بەڵام جارێك ئەسپەکەی لەناو ئاوێ راوەسـتا و نەیویسـت بڕوا • ئـافرەتەکە دەربەست بوو هاوار بکا تاکو بۆپێشەوە لێی بخوڕن •

ئەم ئەسپانە بەسەر شاخەکانا ئێمەیان دەبرد بۆ گوندێ ، ئەوەنـدە سەوز و ئاودار و خۆش بوو من دەمویست دواڕۆژی ژیانمی تێدا رابوێرم•

من که له دنیادا سەفەر دەکەم هەندێجار بڕیاری وا گرنـگ و سـەیر و خەتەرناك دەدەم • بەڵام ئەمجارە بڕیارەکەم بە ڕاستی بوو •

ئێمە بە ئۆتۆمۆبیل گەیشتینە ڕێگای پێنجوین و لەوێوە بە سواری ئەسپ بە ماوەی دوو سەعات گەیشتینە گوندی (سـەرکان) • شـێخی سەرکان ئەسپەکانی بۆ سەر ڕێگا ناردبوو • ئەو تەنیا ئەو دوو ئەسـپەی نەبوو ، بەڵکو نزیکەی بیست ئەسپی هەبوو ، جـارێکیان بـە بەستراوەیی لەپشت دارەکان لەناو کێڵـگەکەی چاوم پێ‌کەوتن • لەپاشان شێخ بێجگە لە سەگی بۆر و سپی دڕی شوان ، تانجیشی هەبوو ، زستانان بۆ ڕاوی بەراز و ورچ دەچوو •

**دێی « سەرکان »ی لای پێنجوین**

سەرکان تەواو دەکەوێتە نـاو شـاخەکان و لە هیـچ لایێـکەوە بە ئۆتۆمۆبیل پێ‌ی‌نـاگەی • زستانـان کە بەفر بـاری تەنـانەت ڕێـگای پێنجوینیش بۆ چەند مانگێ دەگیرێ •

لەم دێیە تەلەفۆن و تەلگرافیش نیە کە بە دنیای دەرەوە ببەستێ • لەبەرئەوە ئەم دێیەم بە «مەڵبەندی پەناگرتن» دانا و بە خەیـاڵ بە خـۆم دەگوت : «بێتو ڕۆژێ ئاژاوە ئەورووپای گرت و لەوێ دنیا ناخۆش بوو ، من دەتوانم بێمە کوردستان و پەنا بەرمە دێی سەرکان تـاکو لەوێ بـە ئاسوودیی بژیم • بەڵێ من هیچ نەبێ دەتوانم بە خەیاڵ بڕۆم یان بە خەیاڵ دڵی خۆم خۆش‌کەم » •

خانەخوێکەمان لە سـەرکان پێ‌ی‌گوتم بێتو بمـەوێ لـەوێ بژیم خانوویێکیشم بۆ دروست دەکەن • ژنانی ماڵەکە زوو بوونە دۆستم • ئەو شەوە نزیکەی پەنجا کەس لەو ماڵە نووستبوون • خۆیان سێ کەس بوون ، بەڵام بۆ پێوانی پەلە زەویەکانی دێیەکە و دیارکردنی سنووری زەویـەکان

چەند ئەندازیار و کاربەدەستیش ئەودەمە لەوێ بوون • یەکێ لە ئەندازیارەکان بە قەمەرەکەی خۆی من و تەرجومانەکەمی هەتا ڕێگا هەبوو برد ، لەوێ بۆ سواری ئەسپ بەجێ‌ی‌هێشتین کە بمانگەیێنێتە مالی خۆمان •

دێی سەرکان باغ و دار و ئاوی هەیە ، ئەم سێ شتە لە کوردستان پێکەوە دەبنە هۆی جوانی دیمەن • لەپاشا دێیەکە بەرزە ، لە ناوەڕاستی هاوین ئێواران و شەوانی فێنك و خۆشە • بێجگە لەمە لە بەردەمی دێیەکە شاخی بەرز نیە کە ماوەی تەماشاکردن تەسك کا ، بەلکو چاو هەتا بتوانێ بڕ دەکا و ئاسۆ دوورە • لەبەرئەوە تۆ لەوێ هەستی دلگیری و دلتەنگی ناکەی •

ئەسپەکانمان لە مەیدانی ناوەڕاستی خانوەکانی شێخ لە سەرکان ڕاوەستاند • لەپاش دابەزین کوتووپڕ ماستاو و ئاوی ساردیان بۆ هێناین• ماستاو لە کاتی گەرما خۆشترین و باشترین خواردنەوەیە • کۆمەلی خەلك هاتنە پیریمانەوە : کەیبانووی مال لەگەل کوڕەکانی و بووکەکانی و ژمارەیێك مندالان • لەپاشان من ژمارەی ئەندامە سەرەکیەکانم زانی • لە مالەکە دە پیاو هەبوون : شێخی گەورە سەرۆکی مال ، سێ کوڕی ژندار ، دوو کوڕەزا ، سێ کەسی بەردەس لەگەل مەلایێکی حافز کە ڕێبەری دینی خێزانەکە بوو • لەم خێزانە حەوت ئافرەت هەبوون : کەیبانوو ، سێ بووك و سێ کارەکەر • بێجگە لەمانە ژمارەیێکی زۆر مندال هەبوون لە تەمەنی جیاواز کە نەمتوانی بە وردی بیانژمێرم و پەیوەندییان بزانم •

ئێمەیان بردە خانووی مێوانان کە لەسەرەوە بە بەرد دروست‌کرابوو و نپ و نوێ بوو • لەوێ چووینە ژووری مێوان • سەرکان لە سولەیمانی بەرزترە کە ٢٥٠٠ پێ لەسەر رووی زەریا (واتا بەحر) بەرزە • لەبەرئەوە

سەرکان فێنك بوو و ژووری مێوان تەواو بە فەرش داپۆشرابوو • مـن وەك ئەوانی‌تری پێش ئەوە بچمە ژوورەوە پێلاوەکانم داکەند •

جاهێلترین کوڕی خێزان کە ژنی هێنابوو هاتە ژوورەوە و لەتەنیشت کورسیەکەی من لەسەر فەرشەکە دانیشت • من لەلایێکەوە حەزم نەدەکرد پێلاوەکانم داکەنم و لەسەر کورسی ئاسن دانیشم • لە لایێکی‌ترەوە جوان و ڕاست نەبوو بە پێلاوەوە لەسەر فەرش دانیشی و ئیتر کورسیت بۆ چیە ؟ کوڕە جاهێلەکە تەماشای جلە شینەکەمی کرد و پرسی : لەگەڵ ئەو هەموو کووتاڵە (واتا قوماشە) جوان و نایابە کە لە بازار هەن بۆچی وا بـەرگی هەرزانم پۆشیوە !! ••• وەڵامی ئەم پرسیارەم پێ نەدرا • بەڵام کە تەماشای ئافرەتەکانی‌تریم کرد کە خۆیان باش بە ئاوریشم پۆشـیبوو و بە خشـڵ ڕازاندبووەوە ، من خۆم وەك چۆلەکەیێکی عاجز و غەمگین دەهاتە بەرچاو •

یەکێ لە بووکەکان دەستی‌کردە ئامادەکردنی سەماوەر و چای • زێڕ و پارە و زنجیری زیڕی پێچەکەی لەژێر تیشکی رووناکی پەنجەرە نزمـەکە دەدرەوشایەوە •

شێخی گەورە بە جوببە سەوزەکەی و مێزەرەکەیەوە بۆ بەخێرهاتـن کردنمان هاتە لامان • تەرجومانەکەم وەك برووسکە دەستی دایە سەرپۆشێکی یەکێ لە ژنەکان و دایە سەرخۆیا و ملی خۆی پێ پێچایەوە • شێخە پیرەکە بۆ ئەو نامەحرەم بوو • نابێ ژن هەرچۆنێ بێ سەرو ملی خۆی بە پیاوێکی نامەحرەم (نەك وەك باوك و برا و کوڕ) پێشان‌دا •

زۆر جار ژنانی کوردستانم دەبینی لەپێش پیاوێکی نامەحرەم سەری خۆیان دادەپۆشن • لە ماڵی تەرجومانەکەم لە سولەیمانی لەکاتێکا پیـاوی نامەحرەم هەبوو ، لەپێش ئەوە چای یان ئاویان بداتێ سەرو ملی بـاش دادەپۆشی • کە ئێوارە نوێنەکانی لە سەربان رادەخست دیسانەوە سەر و

ملی دادەپۆشی ، چونکە لە سەربانەکانی‌تری لەوانەیە پیاوی نـامەحرەم هەبن • لەپاشا ژنان کە لە سەربان دەنوون بیرای بیرای بە سەر ڕووتـی نانوون • سەرپۆشەکەیان پێ‌یە ، بەوە سەریان دادەپۆشن و دەنوون •

لەم دێیە جوانەی خەیالم جارێـکیان چـاوم لە ڕووداوی سـەیری ئافرەتەکان بوو کە چۆن لەبەر هاتنی پیاوێکی نامەحرەم رایان‌کرد و خۆیان شاردەوە • من لە ژووری مێوان دانیشتبووم و لەگەڵ حـەوت ئـافرەتی ماڵەکە قسەم دەکرد • یەکێ لە دایکە جاهیـلەکان منداڵـە بچـووکەکەی پیشانمان دەدا کە بەرگی سووری لەبەر و کڵاوی ئاوریشمی لەسەر کردبووە پارچە زێڕێك وەك وێنەی داسوولکە خرابوە سەر ناوچاوانی • لەپڕێـکا ئەو پیاوە سەرسپیە چارە سووکە لە پەنجەرەکەوە تێپـەڕ بوو کە منی بـۆ سەرکان هێنابوو • هاتبوو تاکو بمانبا بۆ لای ئەندازیارەکانی‌تری کە لەگەڵ فەلاحەکان خەریکی دیارکردنی سنووری زەویەکان بوون • کە سـەری کابرا لە دەرگاکە پەیدابوو ، لەپێش ئەوە بێتە ژوورەوە ئافرەتەکان هەموو بە جارێ کوتووپڕ هەڵسان ، رایانکرد بۆ ژوورێـکی‌تری • یـەکێ لـە خزمەکانی خۆیـان دەرگای ژووری گەنجینـەی بۆ کردنـەوە ، زوو بـە هەناسەبرکێ بۆ ئەوێ رایان‌کرد و لەناو گۆزە و شتی‌تری گەنجینە لەسەر زەویە رووتەکە بۆی دانیشتن• ئەمە هەموو لەبەر ئەوە نەك پیاوێکی نەناسراو — با سەرسپیش بێ — چـاوی پێ‌یان بکەوێ • سەماوەر ، قۆری چای و ئیستیکانەکانیان لەگەڵ من و تەرجومانـەکەم لەژووری مێـوان بەتەنیـا بەجێ‌هێشت • ئەوان لەوێ ، پێش ئەوە نانی نیوەڕۆ بخورێ ، لەگەڵـم خەریکی چای‌کردن و دەمەتەقێ بوون •

جارێکی‌تریش ڕووداوێکی‌وا سەیر رووی‌دا • پاش نیوەڕۆ خـانمی کەیبانوو پێ‌ی‌گوتم پێکەوە بچینە ناو باغەکانی نزیکی ماڵ • من زیـاتر حەزم دەکرد لە ماڵەوە بمێنم تاکو چاوم لە پێك‌هێنـانی فرمـانی (واتـا

وەزیفەکانی) ژنەکان بێ ، ئەو ژنانە کە نانی ئێوارەیان ئامادە دەکرد . یەکێکیان بە هەموو بەرگە جوانەکانیەوە و بە خشڵەکەیەوە لە بەردەم مەنجەڵێکی مسی گەورە چیچکەی کردبوو خەریکی لێنانی پڵاو بوو . یەکێتری خەریکی چێشتی تەماتە بوو ، ئافرەتی سێیەم لەگەڵ کارەکەرێك خەریکی پاككردنی مریشك بوون ، بۆئەوە کە لەپاشان لەسەر ئاگر ببرژێنرێن . دووکەڵ هەموولایێکی گرتبوو . بەڵام ئافرەتەکان باکیان بە دووکەڵ نەبوو و خەریکی جێبەجێ کردنی ئەرکی خۆیان بوون . دایکە گەورە ، خانمی کەیبانوو ، تەنیا خەریکی سەرپەرشتیکردنی شیوەکان بوو .

خانمی کەیبانوو لە لای ئاگردانەکەوە چاوی لە ریزێ سوار بوو کە دەهاتنەوە . ئەمانە زۆریان مێوانەکان بوون بۆ رابواردن بە سواری ئەسپ بۆ راوەماسی چووبوون و هەندێ پیاوی نەناسراویشیان لەگەڵ بوون . ئەمانە هەموو پێکەوە لەتەنشت باغەکەوە بۆماڵەوە دەهاتن . کەیبانوو حەزی نەکرد پێکەوە بۆ باغەکە بچین نەك لەوێ ئەو پیاوە نەناسراوانە چاویان پێمانبکەوێ . چاویان بە کێ بکەوێ ؟ بە دوو داپیرە یەکێکی ئەو و یەکێکی من .

بەڵام من ئیزنم خواست لەگەڵ یەکێ لە ئافرەتە جاهێلەکان کە بووکی داپیرە بوو پێکەوە بۆ گەڕان بچین . لەپاشان هەردوکمان پێکەوە رۆیشتین . باغەکە ــ بۆئەوە کە ئاژاڵ نەچێتە ناوی ــ پەرژین کرابوو . هەردوکمان بەسەر پەیژەکانا بازمان دا و چووینە ناو باغەکە . لەوێ هەنجیر ، تەماتە و سەوزەمان کۆکردەوە و هاتینەوە .

### نووستن و خواردن لە سەربان

ئێوارە دەبوایێ لەگەڵ ئافرەتەکان بچینە سەربان تاکو لەوێ نان بخۆین و بنوین . بەسەر پێپلکەیێکی نارێکی تاریکا دەربەست بووین

بۆ سەربان سەرکەوین • لە سەربان بەڕە ، فەرش و دۆشەك ڕاخرابوون • هەموو ژنەکان لەگەڵ چەند کەسێکی بەردەس لەوێ بوون • لەپاش نانخواردن لەژێر تیشکی فانۆسی نەوت ، کاڵەك و شووتی پاك و قاژ کران • بەشێکی بۆ ئێمە تەرخانکرا ، بەشێکیش نێررایە خوارەوە بۆ پیاوەکان کە لەژێر دارێك لەسەر بەڕە و فەرش دانیشتبوون تاکو لەوێ شیو بخۆن و بنوون •

لەپڕێکا مەلا حافزەکە پەیدابوو • ژوورەکەی نزیك پێپلکەکان بوو • ژوورەکەی داخست و هاتە سەرێ • نەمزانی لەکوێ شیوی (واتا نانی ئێوارەی) خواردبوو • بەڵام لە سەربان هەندێ مێوەی بەدەس کەوت و خواردی •

دنیا وردە وردە سارد بوو • لە چلەی هاوینا سەرمای وا زۆر خۆش بوو • ژنەکان هەموو کورتەکیان لەبەرکردبوو کە بە لۆکە پڕکرابوو • من چاکەتێکی خوریم پێ بوو ، لە زووەکەوە بوو هەڵمگرتبوو ، خوا و راستان ئەوشەوە بەکارهات و لەبەرم کرد • لەوێ لەو سەربانە بەرزە لەژێر ئاسمانی جوانی پڕ هەستێرەی پرشنگدارا شەوێکی خۆشمان رابوارد •

ئێمە ژنان هەموو جلی گەرمان لەبەرکردبوو • بەڵام لە سەربانەکە دوو منداڵیش هەبوون : یەکێکی تەمەنی شەش هەفتە ، ئەویتری سێ مانگ بوو • ئەم منداڵە ساوایانەیان بە لانکەکانیانەوە هێنابوە سەربان • لەژێریان کیسەی خۆڵەمیش و لەگەڵیا قامیشێك هەبوو کە دەخرایە ناوەراستی لاقەکانیان • مەبەست لە کیسەی خۆڵەمێش ئەوەیە منداڵ جێگاکەی تەڕنەکا و مەبەست لەو قامیشە ئەوەیە تەڕایی منداڵەکە بچێتە ناوی و بڕژێتە ناو شووشەیێك کە لە خوارەوە دانراوە [١] • بەمە دایك

(١) لای داوێنی بنی بێشکەوە کونێك هەیە گوزەڵەیەکی دەمپانی لەسەر دادەنرێ تەڕایی منداڵەکەی تێدەچێ . گوزەڵەکە لەبەرئەوە کە



ئافرەتێکی کڵاو پڕ لە خشڵی زێڕ ڤاچەکانی لەناو ئاوی کانی
ژناندا ئەشوا . سەرکان .



هەندێ لە کوڕان و بووکانی ماڵ لەگەڵ ئەسپە نایابەکەمدا ـ سەرکان

دەتوانێ منداڵەکەی لە خۆ تەڕکردن بپارێزێ • بۆ ئەوە کە لەکاتی نووستنا نەجوولێ منداڵەکە باش بە لانکەکەوە دەبەسترێ • تەنیـا سەری و قـاچە بچووکەکانی بە سەربەستی دەمێنن •

ئەو شەوە دایکەکان منداڵەکانیان هەتا درەنگ لە باوەشیان گـرت ،

---

دەمەکەی لە کونی ناو بێشـکەکە گەورەترە ، نـاکەوێتـە خـوارەوە . قامیشەکەش کە پێیدەوترێ قەڵەم و تەڕایی منداڵەکەی پیا دەچێتـە ناو گۆزەڵەکە ، بۆ کوڕ وەك سەبیل وایە، کونێکی خڕ لە سەرەکەیدا هەیە و بۆ کچ قامیشێکە کونێکی درێژکەڵەی لە سەرەکەیەوە تیایە ، ئەو سەرەی بە شوێنی میزکردنی منداڵەکەوە توند دەکرێ و بەمجۆرە کەمجار وادەبێ تەڕایی بەر ئەو پەڕۆیانە بکەوێ کە لە ڕانی منداڵـەکە پێچـراون یـا لەژێریدان .

وەرگێڕ

لەپاشا خستیاننە ناو لانکەکانیان ، چاویان بەستنەوە و پارچەیێ قوماشی جوانیان دا بەسەر لانکەکانیانا و دەسیان‌کردە راژەندنیان هەتا خەویان لێ کەوت •

بەیانی پێش هەڵاتنی رۆژ هەموو هەڵسابوون و ئاگر کرابوەوە بۆئەوە کە خۆیان گەرم کەنەوە •

کارەکەرە گەورەکە لەسەر سینی قاوەڵتی بۆ هێناین کە بریتی بوو لە ماست ، هێلکە و رۆن کە هێلکەکان لەنـاو رۆن مەلەیان دەکرد و نـانی تیری کە شەو کرابوو • ژنان بە هەموو جلی رۆژیـانەوە ـ کە بۆ شـەو نایگۆڕن ـ هەڵسان • تەنیا دوو منداڵە ساواکە هێشتا لەناو لانکەکانیـان لەبەر ئێشی سووتانەکەی دەمرێ •

کارەکەرە گەورەکە زانیم پێشی چەند ساڵێك لە مێردەکەی لەبـەر هەر بۆنەیێك بوویێ جیابووبوەوە • دوو منداڵی هەبوو یەکێکی سـاوا و کچێکی هەشت ساڵان • هەردوو منداڵەکانی لەگەڵ خۆی هێنابوو • منداڵە ساواکەی پاش چەند مانگ مردبوو • کچەکەی لە ماڵەوە بەردەستی دەکردە جارێکیان پێی دەڵێن مەنجەڵی ئاو بخاتە سەر ئاگر • تەنووری گەرم لەسەر رێگای دەبێ ، بەمە نازانێ و دەکەوێتە ناو تەنوورەکەوە • پاش ماوەیێـك لەبەر ئێشی سووتانەکانی دەمرێ •

لە دێیەکە نە دکتۆر هەبوو و نە نەخۆشخانە • تەنیا کاربەدەسـتێکی لەش‌ساغی هەبوو کە دەیتوانی بە سەرپێیی دەرمان‌بدا • نەخۆش دەبێ بە پشتی وڵاغ هاوینان بۆ یـەکێ لە شـارەکان ببرێ • زستانـان بـەفر رێ‌دەگرێ • یەکێ لە دایکە جاهێڵەکان لەپاش لەدایك‌بوونی منداڵـەکەی تووشی نەخۆشی سنگ دەبێ • دەربەست دەبێ ساوا لاواز و نەخۆشەکەی

لەوێ بەجێبهێڵی و خۆی بگەیێنێتــە نەخۆشخــانە • کە دێتــەوە دەزانێ منداڵەکەی مردوە • ژمارەی مردنی منداڵان لێرە یەکجار زۆرە [1] •

## حــەوزی ژنــان

لەپاشان من بە پێپلکە ناخۆشەکانا لە سەربان هاتمە خوارەوە تــاکو بۆ سەر حەوزی ژنان بچم ، ئەو حەوزە کە بە دیوارێکی نزم دەورە دراوە • بەڵێ کە دنیا خۆش بێ بۆ دەس و دەم و چاو شۆرین یان دەسنوێژ هەڵگرتن بۆ ئەو حەوزە دەچن • زستانان کە بەفر دەبارێ و دنیا سارد دەبێ بە گۆزە و مەسینە بۆ ماڵەوە ئاویان بۆ دەهێنرێ • ئەم ئاو هێنانەش یەکێ لە ئەرکەکانی کارەکەرەکانــە •

بەیانی زوو بوو چوومە سەر حەوزەکە و هیوام وابوو کەســی لــێ نەبێ • ئاوی کانی بە بۆرییێکی ئــاسن دەرژایە نــاو حەوزەکە • لەســەر بۆریەکە بۆ نوێژکردنی ژنان تاتەبەردی پاك هەبوو • لەلایێکەوە پــەڕی مریشــك فڕێدرابوو • وا دیــاربوو رۆژی پێشــوو لەوێ مریشــکیان پاككردبوو • لەوێ من پاك دەست و دەم و چاوم شۆری و هاتمەوە •

لەپاشان سواری ئەسپە جوانەکەم بووم کە ملوانکەی شینی لە مــلا بوو • بەسواری ولاغ بەسەر شاخە زەردە نزمەکەدا تێپەڕین و گەیشتینــە چایخانەکەی رێگا • لەوێ خواوڕاستان لەندرۆڤەرەکە چاوەڕێی دەکردین•

### لە دێی سەرگان هەموو شتێ پەیدا دەبێ

لە چایخانەکە ئافرەتێکی هەیاسەداریش چاوەڕێی دەکرد تــاکو بــۆ حەلەبجە بچێ • بە هەیاسەکەیا پارەیێکی زۆر دوورابو • ترێی پێ بــوو

---

(1) ئێستا لەپاش زۆربوونی دەرمان و دکتۆر و نەخۆشخانە ، ژمارەی مردنی منداڵان لە عێراق زۆر کەم بوە .

وەرگــێر

دەیخوارد و هەندێکی پێ‌داین ۰ ئێمە لەپێشان بەخۆشیەوە دەسمانکردە ترێخواردن هەتا پێ‌ی گوتین کە نەخۆشەو تای لێ دێ و بۆ نەخۆشخانە دەچێ ۰ ئیتر نەك ئێمەش تووشی نەخۆشی بین وازمان لە ترێخواردن هێنا۰

من بەمجۆرە لە سەردانی سەرکان گەڕامەوە ۰ لەو دێیە خەڵك دەتوانن هەموو شتێ پەیداکەن بۆ ئەوە کە بە کامەرانی بژین ۰ ئەو دێیە ئەوەندە بەپیت و بەرەکەتە هەموو شتێ پێشکەش دەکا : ئاژاڵ (مەڕ و بزن و ڕەشە ولاغ )ی هەیە بۆ گۆشت و ڕۆن و فرۆ و دۆ و کەشك و تۆراغ و ماست ۰ لە باغەکان داری بەردار هەیە میوەی لی کۆدەکەنەوە ۰ لەو باغانە دەتوانن سەوزە و لە زەویەکانیان تووتن و دانەوێلە بڕوێنن ۰ لە چەمەکە ماسی هەیە دەتوانن بیگرن و لەناو شاخەکان کێوی هەن دەتوانن ڕاوی کەن ۰ خەڵکی دێیەکە تەنیا پێویستیان بە شەکر ، چایی ، خوێ و قوماش دەمێنێ بۆ جل ۰ دەتوانن ئەمانە بە پشتی ولاغ سالی چەند جارێ بۆ خۆیان بهێنن ۰ ئیتر هەقم نیە بلێم من لەم دێیە هەتا هەتایی دەتوانم بژیم ؟



## - ٨ -

# سوالـــكەر و فالـــگر

له هەندێ جێگاكانی كوردستان خەڵـكم دەدی دوعــا ، كووژەكە و مووروویان لەبەر چاوەزار له خۆ داوه • ژنان دوعــا سێ سووچەكانیــان دەخسته ناو ملوانكەكانیان ، یان لەگەڵ پــاره و زێڕی سەركڵاوەكانیــان دەیاندووری • ئەو دوعایانەیان بەهۆی فلكەته لەســەر بەرگی منــداڵان قایمدەكرد • هەندێ جار ئەم دوعایانەم بەدووراوی له كیسه جوانەكانا دەدی كه به دیوارا كرابوون بۆئەوه كه بۆ ماڵ و دانیشتوەكانی چــاكه بێــنێ • جارێكیان له دێیەكەم دوو سەیدم دی بۆ خەڵك دوعایان دەنووسی ، بــه سێ سووچ دەیانووشتاندەوه و به ژنانیان دەدا •

زۆر رێبوار بۆ ئەوه كه شتێكیان پێبدرێ سەریان له ماڵی شێخ دەدا• ماڵ بۆ كردنەوه و قەبووڵكردنی ئەم چەشنه رێبوارانه نەرێتێــكی ( واتــا دەستوورێكی ) كۆنی كوردانه • شێخی خاوەنموڵــك كه بــه پایەبــەرز

دادەندرێ [1] بەرامبەر خەڵکەکە گیانی لێ پرسینەوە و فرمانی (واتا واجباتی) هەیە • سەرۆکی ماڵ کە شێخە لە بنەماڵەیێکی بەرزە و لەبەرئەوە دەبێ ئاگای لە دەسکورتەکانی دێیەکە بێ • حکوومەت بیستم لە سولەیمانی بۆ هەژار و سەقەت و لێکەوتەکان پەناگای دامەزراندوە ، بەڵام لە دێیەکان شتی وا نیە • هەندێ‌کەسی هەژار و سەقەتی واش هەبوون بەناو دێیەکانا دەگەڕان و شت لە خەڵك وەرگرتنیان بە باشتر دەزانی لەوە بچنە سولەیمانی و لەوێ لە پەناگا سەربەستی خۆیان بزر کەن •

جارێك دوو کەس هاتنە ماڵی شێخ : یەکێکیان پیر بوو ، ریشێکی سپی دوولایی هەبوو • ئەویتری جاهێڵ بوو • هەریەکە بو کۆکردنەوەی شت کە خەڵك خێریان پێ بکا کوولەکەیێکی پێ‌بوو • یەکێکیان کوێر بوو • هەریەکە هەندێ ئارد و رۆنیان پێ درا • لەپاشان کە رۆیشتن بۆ گوندێکی‌تری لە ڕێگا چاوم لێیان بوو ، کوڕە جاهێڵەکە کە دەستی خستبوە سەر شانی پیرە چاوساغەکەو وەك وێنە دەسکردەکەی Breughel بە ڕێگاوە دەڕۆیشتن •

جارێکی‌تری دوو ژن هاتن و لە بەردەرگای حەوشەکە لە سێبەر بەکیسەکانیانەوە بۆی دانیشتن بۆئەوە کە خێرەومەندێك شتێکیان بداتێ • یەکێ هات هەندێ ئاوو ماستاوی پێ‌دان • یەکێکی‌تری هەندێ ئاردو شەکری پێ‌دان کە زوو خستیانە ناو کیسەکانیانەوە • هەندێ پارچە جلی کۆنەشیان پێ درا • کارەکەرو منداڵەکان لەپاشان خواردەمەنی‌یان بۆ هێنان • یەکێ لە ژنەکان چاوی کەمبین و خراپ بوو ، ئەویتری شەل بوو • من بڕوام بە چاوم نەکرد کە تەماشام کرد ئەم ژنە شەلە کیسەکانی بەست بە

(1) لەپاش دابەش‌کردنی زەوی بەسەر فەلاحەکانا ، ئیتر شێخەکان پایەی جارانیان نەما ، وەکو فەلاحەکانیان لێ هات .

وەرگێڕ

دارشەقەکانیەوە و بۆ دێیەکەی‌تری کەوتە ڕێ • لە ئەورووپا کە دێیەکان لە یەکەوە نزیکن لەوانەیە سوالکەرێ لە دێییەکەوە بۆ دێییەکی‌تری بچێ • بەلاّم لە کوردستان چۆن ! لێرە دانیشتوەکان بلاّون ، دێیەکان لە یەك دوورن و ڕێگا و بان ناخۆشە • نازانم چۆن لێرە ژنێکی شەل بە سوالّ دەژی •

من چوومە ژوورەکەی خۆم و هەندێ پارەم هێنا و دامە ژنە سوالکەرەکان • ئەوان بە دلّ سوپاسیان‌کردم • بەلاّم ئەوەی شایانی باسە ژنانی مالّەکە ئەمەیان زۆر پێ خۆش‌بوو و سوپاسیان کردم • ئەودەمە هێشتا تەرجومانەکەم نەهاتبوو • بەلاّم باش تێ‌گەیشتم بێتو من ئەو نەختە پارەیەم بە ژنە هەژارەکان نەدایێ ، ئەوە دەبوە لەکەیێك لە ناوی مالّەکە ، ئەو مالّە کە بە چاکەکەر و خێرەوەمەند بەناوبانگ بوو • من کە مێوانی مالّەکە بووم لەبابەت ئەم ناوە باشەوە ئەرکدار و لێ‌پرسراو بووم •

ڕۆژێکی‌تری دوو سوالکەری زۆر ئێسك قورس هاتنە مالّ • ئەمانە دوو پیاو بوون • لە سەرەتادا ویستیان زوو نەختێ ئارد و شەکریان بدەنێ و بەڕێیان‌بخەن • بەلاّم ئەوان هاتنە ناو حەوشەکە و لە هەیوانی پێشخانەکە نزیك بوونەوە • وادیاربوو نەیاندەویست بەئاسانی بڕۆن • ئەوکاتە لە مالّەوە تەنیا ژنان هەبوون • دەسیان‌کردە مامەلّەکردنی شتێك کە من هیچی لێ تێ‌نەگەیشتم • پیاوە بچووکەکە دەستی‌دەدا بە هەگبە سەوزەکەی‌دا و پیاوەکەی‌تری باسی شتەکانی ناو هەگبەکەی دەکرد • لەئەنجامدا هەردو ژنەکان دایك و کچ ڕازی بوون و پیاوەکان هاتن لەسەر قەنەپە دانیشتن و ژنەکان بەرامبەریان ڕاوەستان و لەدوورەوە تەماشای منیان دەکرد و پێ‌دەکەنین • من زانیم شتێ سەیر ڕودەدا ، بەلاّم چیە تێ‌نەگەیشتم •

یەکێ لە پیاوەکان درێژ بوو کەواو عەبای لەبەربوو شتێکی سەوز کرابو بە جامانەکەیا ، وادیار بوو سەید بوو • ئەویتری بچووکتر بوو کەواو

قاپووتێکی ئەستووری کۆنی لەبەر کردبوو ، قاپووتێکی‌وا بۆ زستانی بەفر و باران دەستی دەدا و ئەودەمەش مانگی حوزەیران و زۆر گەرم بوو • ئەمیش سەوزی بەسەرەوە بوو و لەژێر قاپووتەکەی کیسەیێکی سەوز و کیسەی‌تری هەبوون • لەکیسە سەوزە چلکنەکەی کتێبێکی دەرهێنا • بۆ من کتێب موهیم نەبوو • چونکە من لەبابەت ژنانەوە لێ‌کۆلینەوەم دەکرد و کەسیان لەودەمە لە تۆپزاوە خوێندەوار نەبوون • من لەپێشدا وام‌زانی کتێبەکە قورئانی پیرۆزە • بەلام لەپاشان پێ‌یان‌گوتم کتێبی فالە و کابرا فالگر بو • کەیبانووی مالەکە دەستی نایە سەر کتێبەکە • وادیاربوو فالگرەگە باش دەیزانی فالەکەی کاردەکاتە ژنەکان و وا دیار بوو بەرامبەر فال‌گرتنەکەی داوای پاداشتی دەکرد • ئەو کتێبەکەی کردەوەو بەدەنگ بەرزی و بە شێوەیێکی گۆرانی دەستی‌کردە خوێندن • ژنەکان لەلایێکەوە بە بێزاریەوە تەماشایان دەکرد و لە لایێکی‌ترەوە بەریزەوە گوێ‌یان لێ دەگرت تاکو بزانن لە کتێبەکە چی تازەو نەزانراو هەیە • کچەکە بە پاداشتی ئەم فال‌گرتنە میقدارێکی باش شەکرو ئاردی بۆ هێنان کە زوو رۆیان‌کردە کیسەکانیانەوە • وادیاربوو درێژەکەیان بەمە رازی نەبوو داوای شتی‌تری دەکرد •

لەپاشان لە گیرفانی هەندێ قاقەزی دەرهێنا و بە قەلەمێکی سوور هەندێ شتی لەسەر نووسی و کردیە سێ سووچ و دای بە کەیبانوەکە • بە پاداشتی ئەمە هەندێ‌تری ئاردیان پێ درا • کە رۆیشتن دایکەکە دوعاکەی بردو خستیە ناو سەنووقێکی بچووکەوە • من حەزم دەکرد بزانم چیە ، بەلام حەزم نەکرد لە خۆمەوە بە فزوولی بۆ تەماشاکردنی بچم • لەدوایيدا دایکەکە بانگی کردم بۆئەوەکە تەماشای بکەم • کە چوومە نزیک سەنووقەکەی پێ‌ی‌گوتم دوعاکە هێشتا لە بەرگ نەگیراوە و نابێ بیکەمەوە و بە چاویلکەکانم تەماشای بکەم • چونکە بێتو ئەمە بکەم دوعاکە بەتال

دەبێ و ئیتر کارناکا • بەمجۆرە داخەکەم نەمتوانی بزانم لەناو دوعاکە چی هەیە •

لەپاش ڕۆیشتنی ئەو دوو چارە قورسە کچی گەورەی ماڵەکە خەریکی پاك‌کردنی هەردو ژوورەکانی مێوان بوو کە من لە یەکێکیان دەژیام • لەپڕێکا دوو سواڵکەر پەیدابوون : یەکێکیان دەستێکی تەنەکەی پێ بوو کە دەسکەکەی بە ئاوریشمی سەوز داپۆشرابو • کچەکە دەستە تەنەکەکەی وەرگرت و نایە ناوچاوانیەوە و دایەوە و بە دانی هەندێ شەکر و ئارد بەرێ‌ی‌خستن • لەپاش ئەوە ئیتر زۆر سواڵکەر دەهاتن • جارێکیان چوار بە جارێ هاتن کە مێزەری سەوزیان بەسەرەوە بوو و خەڵك خێریان پێ دەکردن •

لە سولەیمانیش تووشی هەندێ سواڵکەر بووم کە نەدەگەڕان ، بەڵکو لەقوژبنێ لە بەردەم مزگەوت دادەنیشتن • ئەو مزگەوتە کە نزیك ماڵمان بوو دوو دەرگای هەبوو • لە بەردەم دەرگا بچووکەکەی ژنێکی پەچە و عەبادارم دەدی ، دانیشتوە سواڵ دەکا • لەولایەوە منداڵێکی سەقەت و ناتەواو هەبوو خرابوە ناو عارەبانەی منداڵان و سواڵی پێ دەکرا • لە سولەیمانی بیستم حکوومەت بۆ پیر و سەقەت و هەژاران پەناگایێکی دامەزراندوە و لەوێ تەماشا و خزمەتیان دەکەن • بەڵام سواڵکەرەکان لەوە زیاتر حەزدەکەن سواڵ بکەن و سەربەستی خۆیان بپارێزن •



## - ٩ -

# ئاگری نەکوژاوەی باباگوڕگوڕ

کە یەکێ بە ئۆتۆمۆبیل شەوان لە کەرکووکەوە تێپەڕی بۆ ئەوە کە بەرەوخوار بۆ بەغدا یان بەرەوژوور بۆ هەولێر بڕوا لەلای بیری نەوتەکان چاوی بە ئاگرێکی گەش و بەرز دەکەوێ کە لای رۆژئاوا ڕووناك دەکاتەوە. ئەم ئاگرە یەکێ لە نیشانەکانی شاری کەرکووکە و بە شەو باش دیارە و سەرنجی مرۆڤ تەواو رادەکێشێ ، بەڵام بە رۆژ ئەوەندە باش دیار نیە . ئەمە غازی نەوتە هەروا دەسووتێ . وڵاتی عێراق لە نەوت زۆر دەوڵەمەندە ، لەبەرئەوە باجی زۆر کەمە . من بیستم کوڕێکی جاهێڵ کە دەیەوێ ژن بێنێ و بۆ دوارۆژی ماڵ پێکەوە بنێ پشتی تەنیا بە مووچەی دوارۆژیەوە دەبەستێ . هەرچی پارەی هەیە ، هەندێجار بە ئیسرافەوە ، بۆ کڕینی ناوماڵ و رازاندنەوەی بووکەکەی خەرجی دەکا . ئەمانە بیر لە دوارۆژ ناکەنەوە کە لەوانەیە پێویستیان بە پارە بێ بۆ پارازتنی لەش‌ساغی ، منداڵ

پەیدابوون یان باجی حکوومەت • ئەم کەم باجیە جێگای چارەسەرکردنی کارەساتی ژیان لە کۆمەڵ واتا تەئمینی ئیجتیماعی دەگرێتەوە •

دەسکەوتی زۆری نەوت بوەتە هۆی زۆری پارە و ئۆتۆمۆبیل • بەڵێ کەم کەس دەتوانن ئۆتۆمۆبیل بکڕن ، بەڵام ئۆتۆمۆبیلی گەورە و لوکس و جوان زۆرن و هەندێ کەس هەموو سالی مودێلی ئۆتۆمۆبیلەکەیان دەگۆڕن • لەبەرئەوە قەمەرەیێکی (دێسۆتۆ)ی ئەمریکی لەوانەیە دەساودەس بگاتە دەس خاوەن تەکسی ، کە پێش چەند رۆژێ هیی وەزیرێك بوە •

## چوون بۆ هەولێر و مووسڵ

من یەکێ لەم قەمەرە لۆکسانەم بە پارەیێکی کەم بە کرێ گرت تاکو لەگەڵ تەرجومانەکەم و براکەی بۆ کەرکووك ، هەولێر . رەواندز و مووسڵ بچین بۆئەوە کە ئەو ناوانەش ببینم ، کە بەرگی تایبەتی وایان هەیە ــ بەتایبەتی بەرگی پیاوان ــ لە هیی سولەیمانی ناچێ •

بۆئەوە کە لە گەرمای رۆژ رزگار بین بە شەو دەکەوتینە رێ • لە کەرکووکەوە گەیشتینە هەولێر و لەوێوە بۆ مووسڵ دەچووین • لەسەر رێگا پێش نیوەشەو چاومان بە قەمەرەیێك کەوت کە لەناو چاڵێك سەربەرەوخوار کەوتبوو • من ویستم قەمەرەکە راگرین و راوەستین تاکو بتوانین دەسی کۆمەکی بۆ رێبوارەکان درێژ کەین • من ئەمەم بە فرمانی (واتا وەزیفەی) خۆمان دەزانی بەڵام تەرجومانەکەم عەباکەی بە خۆیەوە پێچا و بە توندی گوتی : « ئێمە ئافرەتین ، ناتوانین لێرە لەم نیوەشەوە راوەستین ، با پیاوێکشمان لەگەڵا بێ » •

## ژنانی موسولمان نازدارن

لەناو موسولمانان ژنان بەقیمەتن ، نازدارن ، بە چاوێکی بەرز

تەماشایان دەکرێ و دەپارێزرێن • ژنان پایەیێکی بە ئیمتیازیان هەیە ، ئەو پایەیە کە ئێمە ژنانی سەربەخۆ و سەربەستکراوی رۆژئاوا لە زووەکەوە لەبیرمان چوەتەوە و نایزانین • ئێمە لەگەڵ پیاوەکان و لەپاڵ پیاوەکان یەکسانیمان بە دەس کەوتوە • بەڵێ ئەم یەکسانیە زۆر لای چاکی هەیە : زۆر مافمان بە دەس کەوتوە • بەلاّم لە لایێکیترەوە زەرەر و زیانمان لێکەوتوە • بۆ وێنە پیاوەکان نازمان ناکێشن و دەربەست (واتا مەجبوور) نین بمانپارێزن • چونکە لە دلی خۆیانا دەلێن ژنانیش وەك ئێمەن ، با خۆیان خۆ بپارێزن ، بێتو نەیانتوانی با بچن داوای دەستی یاریدە لە حوکوومەت بکەن • ئەی ئێمە پیاوان کە تووشی خراپەیێك بووین هاوار ناکەینە لای حوکوومەت ، با ژنانیش وابکەن •

کە تەرجومانەکەم لە سولەیمانی یان لە بەغدا لە بازاڕ شتی دەکڕی ، خۆی شتەکانی هەلنەدەگرت بەڵکو دەیدا بە حەماڵێ بۆی هەڵگرێ • منیش کە جانتاکەم قورس دەبوو دەمدایە حەماڵ • ئەم جۆرە حەماڵە بچووکانە لەناو بازاڕدا زۆرن •

لەگەڵ تەرجومانەکەما من لە ڕۆژهەلاّت گۆڕام ، بووم بە شتێکی هەڵبژێرراو کە دەبوایێ هەمیشە دڵم رابگیرێ و لەسەرم بکرێتەوە • زۆر سەیر و خۆش بوو بۆ من هەندێجار بەتەنیا بگەڕێم • کوردەکان ئەوەندە بە رێز و حورمەت و باشی موعامەلەیان لەگەڵ دەکردم : وابزانم کە بگەڕێمەوە رۆژئاوا تووشی سەرسامی دەبم •

بەلاّم ژیانی ئافرەتانی موسولمان بە زۆر نەریتی (واتا رەوشتی) کۆمەلایەتیەوە وەك پەرژین دەورە دراوە و سنووری بۆ دانراوە • لەبەرئەوە هەندێجار تەرجومانەکەم دەکەوتە ناخۆشیەوە • لە بازاڕ بۆ وێنە نەیدەتوانی بادەیێ شەربەت یان فنجانێ چای بخواتەوە ، لەگەڵ ئەوەشدا توونی بوو ؛ چونکە ئافرەتێکی پەچەدار نەدەبوو ئەوە بکا • لە بەغدا نەیدەتوانی

لەپێشەوەی چایخانەیێکی بچووکی هەرزان دانیشێ ، لەو جێگایانە کـە تەنیا پیاوان دادەنیشتن • دەبوایێ پێکەوە بچین بۆ سەرەوە بۆ ئەو جێگا تایبەتیانە کە بۆ ژنان تەرخان کراوە و لەسەری نووسراوە (خاص للعائلات) واتا بەتایبەتی بۆ ئافرەتانە • کە بۆ جێـگایێ دەچووین و قەمەرەکە لـە بەردەم چایخانەیێکی بچووك ڕادەوەستا نەدەبوو ئەو لەپێشەوە لەسـەر تەختە ڕەقەکان و لەژێر کەپر و سابـات دانیشێ • دەبوایێ کورسی ببردایێ بۆپشتەوە و لەوێ پێکەوە دانیشین • بێتو چایخانەکە باغی بوایێ وەك لـە قەرە هەنجیر دەبوایێ بچینە جێگا تایبەتیەکەی ئافرەتان •

جارێکیان لەگەڵ چەند ژنێکی پەچە و عەبادار لە هەڵەبجەوە بە قەمەرە بۆ زیارەتی گۆڕی پیاوێکی چاك ــ کە دوور نەبوو ــ چووین • خـاوەن قەمەرەکە بۆ جێگاییێکی‌تری دەچو و دەیویست زوو بچین و بگەڕێینـەوە • کە گەیشتینە گۆڕستانەکە ، تەماشام کرد گۆڕەکان تووشی بواردن ( واتا اهمال) بووبوون • هەندێکیان بەردەکانیان کەوتبوو • پێش‌ئەوە بچینـە ناو گۆڕستانەکە ژنەکان بزربوون • من لەپشت دیوارێکی نزم گوێـم لـە شلپە شلپی ئاو بوو • وا دیار بوو دەسنوێژیان هەڵدەگرت • لەپاشـان پێیان گوتم بێ‌دەسنوێژ نابێ بچنە ناو گۆڕستانەوە • گۆڕی پیاوە چاکەکە لە ژوورێکی بچووکی تایبەتی بو و سەری بە سەرپۆشێکی سەوزی جوان داپۆشرابوو • لەدەرەوە دارێ هەبوو کە پارچە پەڕۆی ڕەنگاورەنگی پێوە هەڵواسرابوو • ئەمە ئەو ژنانە هەڵیانواسیبوو کە مەرامیان هـاتبوەجێ ، تەواو وەك ژنە مەسیحیەکانی کلێسەی کاثۆلیك کە شـت بـە دیوارەکانا هەڵدەواسن ، یان ناو دەنووسن بۆ ئەوە کە مەرامیان بێتەجێ • ژنێـك بەردێکی بچووکی پـانی هەڵـگرت و ویسـتی بینووسێنێ بـە دیواری ژوورەکەوە و بە منی گوت بێتو بەردەکە بە دیوارەکەوە بنووسێ، مەرامەکەی دێتەجێ• منیش خێرا بەردێکی پالم دۆزیـەوە و ویسـتم بـە دیوارەکەوە



ئافرەتێکی لاو لەسەر بانێکی قوڕین بە دانیشتنەوە لەسەر سینیەکی مس جگەرە تێئەکا ـ سەرگەڵوو



بزن دۆشین بە شێوەی کۆنی کوردی لە دواوە

رایگرم و به پەستۆی دەستم پێوە بینووسینم و قایمی کەم • بەڵام بەردەکەم داخەکەم قایم نەبوو • وادیاربوو بەردەکە زۆر گەورە بوو رانەوەستا یان مەرامەکەم نەدەهاتەجێ •

**چوون بۆ دیمەنی تەوێڵە**

ئەم ڕەوشتی دەسنوێژ هەڵگرتنەم لە دێی گەورەی تەوێڵەش دی نزیك یان لەسەر سنووری ئێران • لە تەوێڵە پیاو و ژن لەپێش زیارەتی گۆڕی پیاوێکی چاك دەسنوێژیان وەردەگرت • لە تەوێڵە لە ماڵێکی باش دابەزین • لەوی ژوورەکانی خوارەوە بە فەرشی نایاب داپۆشرابوون و لەبەر فێنکی هەوا خەڵك شەوان نەدەچوونە سەربان بەڵکو لەژوورەوە دەنووستن • لەم ماڵە لە نهۆمی یەکەم ژووریك بۆ دەسنوێژ وەرگرتن ، خۆشۆرین و توالێت تەرخان کرابوو • ژوورەکە زۆر جوان بوو ، وا دیار بوو هەر بۆ سەیر و خۆپێشاندان دروستکرابوو • چونکە خەڵکی ماڵەکە: مێردەکە ، هەر سێ ژنەکانی و خوشکە گەورەکەی هەموو وا دیار بوو ئەو ژوورە بەکارناهێنن و دەچن بۆ جێگای شۆرینی هەموانی لەناو بازاڕ •

لەم ماڵە هەر سێ ژنەکان وەك خوشك لەگەڵ یەك دەژیان ، لە ئیش و کاری ماڵ یارمەتی یەکتریان دەدا و چاویان لە منداڵی یەکتری بوو• خانوەکە گەورە بوو و لە ناوەڕاستی حەوشێك هەبوو کە باغی گوڵ ، حەوزی ئاو و کانیێکی ساردی تێدابوو• لایێکی ماڵەکە بە دیوارێکی نزم دەورە درابوو ، ئەو دیوارە کە ماڵەکەی لە بازاڕ و چەم جیا دەکردەوە • لە نزیك ماڵەکە مەیدانی گەورەی دێیەکە هەبوو • لەم مەیدانە ئەو پاسە رادەوەستا کە رۆژی جارێ دەکەوتەرێ بۆ هەڵەبجە و لەوێ بازاڕ و دووکانیش هەبوو • لە خوارەوەی بازاڕەکەی تەوێڵە لەژێر زەوی جێگای شۆرینی ژنان هەبوو کە زۆر گەورە بوو و بۆ خۆشۆرین ، خوری پاككردن و جلشۆرین و شتی تری چەند حەوزێکی تیابوو • کە لە



ئافرەتێ خەریکی ئیش‌کردنە لە ژووری خانوویەکی لە قوڕ
دروست‌کراودا کە تەنوورێکی تیایە . سلێمانی

مەیدانەکەوە بە پێپلیکەکانا بۆ ئەم ژوورانە چوومە خوارەوە کە تاریك بوو و تەنیا لای چەمەکە ڕابوەوە ژنێکی هەرزەکار لەترسانا لە قوژبنێك خـۆی شاردەوە • من شەبقەیێکی ئەستوورم بەسەرەوەبوو و کراسێکی درێــژم لەبەر بوو • ژنەکە وای‌زانی من پیاوم و بە ناخێری گیانم هاتوومەتە ئـەو جێگایە لە بەتایبەتی بۆ ژنان تەرخان‌کراوە • ژنەکە هەقی بوو ، لە تەوێلە ژنی وەك منی نەدیبوو •

ژنانی ئەم دێیە ، بەلکو ئەم شارە بچووکە هەموو دەمێ چاکەتێـکی درێژی قەدیفە یان سورمەیان لەسەر جلەکانیانەوە لەبەردەکرد • ئەمە بـۆ خۆداپۆشین لەبەر سەرما نیە ، ئێرەش وەکو جێگاکانی‌تری کوردستان بـە ڕۆژ زۆر گەرمە • بەڵام ئێواران و شەوان فێنکە • لەبەرئەوە بۆ نووستن ناچنە سەربان بەلکو لەناو ژوورە پرفەرشەکانیـان دەنون • ئەم ژنـانە بەشی خوارەوەی چاکەتە درێژەکانیان دەنوشتێننەوە و لەسەر پشتیـان رای‌دەگرن • دەیانگوت ژن نابێ پشتی خۆی بە بێ چاکەت پێشـان‌دا • ئەمەی کرد عەیب و شوورەییە •

ئافرەتانی ئەم ماڵە ، کە باشترین ژنانی شارەکە بوون ، هەموو کاتـی خۆیان لە ماڵەوە رادەبوارد و نەدەچوونە گەڕان • ئێمـەی مێوانـەکان گەڕانێکی کورتمان کرد بۆ ناو شاخەکان بۆ ئەوە کە لە دلی خۆمانا بلێین ئێرانمان دی ، چونکە شاخەکانی عێراق لێرە تێکەڵ شـاخەکانی ئـێرانی ئەوبەری سنوور دەبن و لە یەك جیاناکرێنەوە • ئافرەتەکانی ماڵەکە گوتیان ئەمە پانزە ساڵە نەچوونەتە قەد ئەو شاخانە •

یەکێ لە کچەکانی ماڵەکە ئێمەی برد بۆ دیتنی مزگەوتەکانی ئـەم دێ گەورەیە و چووینە ناو یەکێ لەو مزگەوتانە کە لەسەر چەمەکە بوو و بۆیان گێڕاینەوە کە ئەم مزگەوتە بە ئەمری خوا ئەوەندە بەرز بوەتەوە • لەپاشان شکلی مزگەوتەکە و کەمەرەکانی (واتا قەوسەکانی) سەر دەرگا و پەنجەرەکان

کاری (واتا تەئثیری) چەشنی خانووی ئێرانی پێشان‌دەدا • لەپێش ئـەوە پێڵاوەکانمان داکەنین و بۆ ژووری مزگەوت بچین ، ئافرەتەکان چوونە سەر حەوز و دەسنوێژیان وەرگرت • گۆڕەکان لەسەر زەوی دروست‌کرابوون و هەر یەکە بەردێکی لای سەرەوەی هەبوو • لەپاشان لەسەر هەر گۆڕێـك محەجەرەیەکی نزمی ئاسنین هەبوو • کچی ماڵەکەمان بە خۆشی و نـەرمی محەجەرەکەی ماچ‌کرد • پێش ئەوە بچینە ناو مزگەوتەکە ـ وەکوو لەپێشدا گێڕامەوە ـ پێڵاوەکانمان داکەند • لێرە نابێ بە پێڵاوەوە بچیە ناو مزگەوت یان ژوور کە فەرشی لێ راخرابێ • چونکە بەڕە و فەرش و مافوور بۆئەوە رادەخرێ لەسەری دانیشی ، نان بخۆی و بنوی • لەبەرئەوە نابێ بە پێڵاو کە لە دەرەوە لە پێی دەکەی پیس و قوڕاوی بکەی •

بەڵام لەم ساڵانەی دوایی لەباتی سـۆل ، کەوش و کڵاش ، پێـڵاوی ئەورووپایی (واتا قۆندەرە) زۆر بوو و ئەمە بوە هۆی ناخۆشی و ماندوویەتی• چونکە تۆ دەتوانی سۆلەکەت و پیـاو دەتوانێ کەوش یان کڵاشـەکەی بەئاسانی و بە بێ دەس‌لێدان لەبـەر دەرگای ژوور داکەنی • بـەڵام بـۆ قۆندەرە وانیە • تۆ دەبێ بچەمێیتەوە و قەیتانەکەی بکەیتەوە بۆ ئەوە کە لـە پێت دەرچێ • بیستم لە تەوێـلە کڵاشی زۆر جوان و بـاش دەکرێ ، کە ژێرەکەی لە پەڕۆ دروست و بە چەرم قایم دەکرێ و سەرەکەی دەچنرێ • کڵاش بۆ رۆیشتن زۆر خۆشە ، کە بەسـەر بەردەڵانێـکی لێـژا بڕۆی ژێرکڵاشەکە بەردەکان دەگرێ ، لەبەرئەوە پێت‌ناخزێ • لەپاشا تۆ دەتوانی پێش ئەوە بچیتە ناو ژوورێکی پڕفەرشەوە بەئاسانی لەپێتی داکەنی • ئێستا لە دیوەخانە تازەکان خەڵك پێڵاوەکانیان داناکەنن و ئەمە داخەکەم لەبابەت دەستووری لەش‌ساغی و پارازتنی فەرشەوە دەبێتە گۆڕانێـکی خراپ •

**چوون بۆ کەرکووك**

کە لە سەفەری رەواندز گەڕاینەوە ، لە کەرکووك تێپـەڕین و لەوێ

توانیمان بە یاریدەی ئەندازیاریێ ـ کە لەسەر کاری بەستێنی دووکان ناسیم ـ ناوچەی بیرە نەوتەکان ببینم • ئەم ئەندازیارە بە قەمەرەکەی ئێمەی بەناو شیرکەتەکەدا گەڕاند و ئەو شتانەی پێشاندایین کە دەتوانین ببینین • لە جێگایێ چاومان بە نەوتی ڕەش و سەوزی خاو کەوت کە لە زەویەکەوە دەردەچوو • لە جێگاییێکیتری زەویەکە دەسووتا • وادیارە لەوێ غاز دەردەچێ و ئاگری تێبەربوە و هەروا دەسووتێ• لە جێگاییێکیتری چاومان بە یەکەمین بیر کەوت کە نەوتی لێ دەرهێنرا و نەوتەکەی تەواو بوو گیراوە • رۆژی دەرهێنانی نەوت و تەواوبوونی لە سەردەمی بیرەکە نووسرابو •

لەپاشان گەیشتینە یانەی فەرمانبەران کە تازەترین حەوزی مەلەکردنی لێ دروستکرابوو • کاشیەکانی وەك ڕەنگی شەختە شینکار بوو و هەستی فێنکی بە ئێمە دەدا لە ئاو و هەوایەکدا ئەوەندە گەرم بوو جلەکانمان بە ناو قەمەرەکەوە دەنووسا •

چاوپێکەوتنی ئەم حەوزە جوانە کە لەسەر پلانی کەلیفۆرنیە نەك دێنمارك دروستکرابوو نیشتمانی خۆمی هێنامە بیر و نەختێ دڵی کزاندم و عاجزی کردم • حەوزەکە زۆر جوان بوو و هێڵ و قوڕنەکانی زۆر ڕاست بوون • بەڵێ لەپاش ئەوە کە ماوەییێك لەناو کوردەکان بە خۆشی ژیام و تێکەڵی ئافرەتانێ بووم کە دڵی منیان رادەگرت ، هەرچۆنێ بێ من بیری نیشتمانی خۆمم کردەوە ، ئەو نیشتمانە کە چاك بێ خراپ بێ نیشتمانمە ، وڵاتی کەس و کارم و با و باپیرمە ، لەوێ هاتوومە دنیا ، لەوێ ژیاوم و لەوێش دەمەوێ بنێژرێم •

ئەندازیارەکە ئێمەی لەگەڵ دوو پیاویتر بۆ نانی نیوەڕۆ بانگکرد • من حەزم دەکرد بچم و لەوێ بیرەی دێنمارکی بخۆمەوە • بەڵام من چۆن دەمتوانی تەرجومانەکەم بۆ ئەم دانیشتنە بانگ کەم و لەگەڵ دوو پیاوی

نامەحرەما بێ‌پەچە دانیشێ • لەبەر ئەوە من سوپاسی ئەندازیارەکەم کرد و نەچووم •

لەپاشا بیرم‌کردەوە لە تاخمی چەقۆ و کەوچك و چەتاڵ و قاپ کە لە نانخواردنێکی سادە لای ئێمە بەکاردەهێنرێ • ئێمە ئەم چەشنە نانخواردنەمان لە ئەورووپا لە زەمانی لویسی چواردەمین فێربووین و بەم‌جۆرە ئێستا بە ئەزیەت و ناخۆشی برسیەتی خۆمان ژیردەکەین • چاك بوو لەگەڵ تەرجومانەکەم بۆ نانخواردنەکە نەچووین ، چونکە وابزانم تەرجومانەکەم بەکارهێنانی ئەو جۆرە تاخمی خواردنەی باش نەدەزانی •

ئێمە ئەو شەوە دەبوایێ لە ماڵی پیاوێك مێوان بین کە دوو ژنی هەبوو و بۆ هەر یەکە خانوویێکی بچووکی تەرخان کردبوو • خانوەکان پشتیان لە یەك بوو و لە دەرەوە دەتتوانی لە خانوێکەوە بۆ ئەویتری بچی • هەر خانوویێك بریتی بوو لە دوو ژوور و پێشخان و حەوشەیێکی کراوە • ژوورەکان لەسەر شەقام بوون ، لەبەرئەوە پەنجەرەکانی بەرزبوون ، تاکو لەدەرەوە خەڵك چاویان بە ناو ژوورەکان نەکەوێ • لە پێشخانەکەوە تۆ دەچووی بۆ حەوشەکە کە بە بەرد داپۆشرابوو گەرماو و جێگای چێشت‌لێنانی تێدابوو • لە لایێکی حەوشەکە دار مێوێك هەبوو کە بە گەڵاکەی نیوەی داپۆشیبوو • بە پێپلکەیێ تۆ دەچوویتە سەربانێکی تەخت کە بە دیوار شوورەی کرابوو ، ئەمە بەپێچەوانەی زۆری سەربانەکانی سولەیمانی بوو کە بێ‌شوورەن • یەکێ لە ژوورەکانی هەر خانوێك بۆ مێوان تەرخان کرابو و کورسی و قەنەپە و مێزی لێ بوو • ژووری دووەم هی‌نووستن بوو • لەوکاتە کە هاوین بوو بەڕە و دۆشەکەکان لەسەر زەوی راخرابوون و چوارپایەیێ بۆ نووستنی شەو لە حەوشە دانرابوو • لەتەنیشت دیوارێکەوە مەکینەیێکی دوورینی سنگەر هەبوو کە بۆ چاوەزار کووژەکەیێکی پێوە کرابو • لەتەنیشت مەکینەکە چەند سەنووقی ئاسنی

رەنگاورەنگ هەبوون کە جل و بەرگی ژنانەی کوردەواری تێدابوو • بەڵام لەودەمە ئافرەتەکان کراسی سپی درێژیان لەبەرکردبوو • ئەم بابەتە کراسانە ژنە تورکمانەکانی کەرکووك لەبەریدەکەن • کراسەکان ناشیرین بڕابوون و بە نارێکی دوورابون • یەکێ لە ژنەکان قامکی (واتا پەنجەی گەورەی) پێی دەیێشا • کە ئێمە لەوێ بووین ژنێکی لادێیی دەس و ناوچەوان کوتراو خەریکی قاچی ئافرەتەکە بوو ، رۆنی لێدەدا و دەیبەست•

ئێوارە هەردوکمان پێکەوە لەگەڵ هەردوو ژنەکان شیو (واتا نانی ئێوارە)مان خوارد و بێژمارە چایمان خواردەوە • ئێوارە ئێمە و نەخۆشەکە لەژێر دار مێوەکە لەسەر دۆشەك خەریکی دەمەتەقێ بووین • نەخۆشەکە لە ژوورەکەی وەڕس بووبوو و بە حەوشەکەی دڵی دەکرایەوە • مێردەکەیان ئەوەندە پیاوێکی باش بوو هەردوو ژنەکانی بۆ حەج ناردبوو : یەکێکیان بە پاس و ئەویتری بە فڕۆکە بۆ حیجاز چووبوون • من پرسیم بۆچی هەردوکیان پێکەوە نەچوون ؟ ئەمە پرسیارێکی بێ جێ و گەوجانە بوو • ئەم جۆرە سەفەرە چەند مانگێکی پێدەچێ • موسوڵمانێك پارەیێکی زۆر خەرج ناکا بۆهێنانی دوو ژن بۆ ئەوە کە خۆی نزیکەی سێ مانگ بەتەنیا بژی •

لەپاش حەجکردن ئەم ئافرەتانە بوونە حاجی • بەپێی نەریتی ( واتا دەستووری ) ئێرە ئافرەتی حاجێ نابێ قۆڵی بە ڕووتی دەرخا و دەبێ سەری بە سەرپۆشێکی سپی داپۆشێ • ئەو ئێوارەیە هەردوکیان لەژێر سەرپۆشەکەیان روویان بە خۆشی و رەزامەندی و کامەرانی دەدرەوشایەوە• من نەمزانی کامیان گەورەتر بوو •

مێردەکە ئێوارە درەنگ لە ئیش گەڕایەوە • کاسبیەکەی فرۆشتنی پایسکیل و پارچەی ئۆتۆمۆبیل بوو ، کراس و پانتۆڵی ئەورووپایی لەبەربوو •

وادیاربوو ئەو لە دەرەوە نانی خواردبوو ، ئێمە پێکەوە شیوێکی باش و بەتامماں خواردبوو لەگەڵ ماستاوی سارد و مێوە • بەڵام ئەو لەگەڵ ئێمە چای خواردەوە • ئێمە ژنان لەسەر دۆشەك دانیشتبووین ، پیاوەکە لە دوورەوە لەسەر کورسییێکی بچووکی بێقۆڵ بەرامبەرمان دانیشتبوو •

بەلێ پیاوەکە بەرامبەرمان دانیشتبوو ، بەڵام وای پێشاندەدا کە ئەندامی ماڵەکە نەبێ و لە ماڵەکەی بێبەش بێ • ئەو دوو ماڵی هەبوو ، هەریەکێ بۆ یەکێ لە ژنەکانی ، بەڵام ژووری تایبەتی خۆی نەبوو کە شتەکانی خۆی تێخا • رۆژی دووەم کە چووینە ماڵی ژنی دووەم ، تەماشامان کرد ئەویش تەواو وەك ماڵی یەکەمە • ژووری مێوان باش بە قاقەزی رەنگاورەنگ رازابوەوە • لەلایێك چەند بووکە شووشەی ئەورووپایی هەبوون لەگەڵ خانوو و شتومەکیان • وادیاربوو ئافرەتەکە ــ کە منداڵی نەبوو ــ زۆر حەزی دەکرد منداڵی ببێ و خەوی بە منداڵ بوونەوە دەدی • لەبەرئەوە ژوورەکەی بە بووکە شووشە رازاندبوەوە و بەوە نەختێ تەسکینی دەهات •

من وردە وردە تێگەیشتم مێردەکە لە هەردوو ماڵەکە دەژیا : رۆژێ لەگەڵ ژنی یەکەم و رۆژێکیتری لەگەڵ ژنی دووەم • ئێوارە چوە ماڵی یەکەم و جلی شەوی لەبەرکرد و هاتە لای ژنی دووەم کە نەخۆش بوو • لەپاشا شەو لەگەڵیان باسی پێویستی رۆژی دووەمی کرد • ئەو نەك ژنەکانی لە بازار خۆراك و پێویستی رۆژبەرۆژی دەکڕی • لە سولەیمانیش لە ماڵی تەرجومانەکەم ــ کە باوکی دوو ژن و حەوت کچی هەبوو کە پێنجیان گەورە بوون ــ ئەو باوکە پێویستی هەمە رۆژەی دەکری • بەیانیان دەچوە بازاڕ و لەگەڵ کوڕێکا دەهاتەوە کە گۆشت و سەوزە و مێوەی لەناو زەمیلەیێ هەڵدەگرت •

مێردەکە بە کراسێکی درێژ و پێلاوێکی ناوماڵەوە هات لەسەر دۆشەک لە تەنیشت ژنە نەخۆشەکەی دانیشت • ژنەکە نرکە نرکی بوو لەبەر خۆیەوە دەیگوت : « وەی نەنە ، وەی نەنە » واتا « ئای دایە ، ئای دایە » • مێردەکە شتێکی بەدەستەوە بوو لەسەر دۆشەکەکە داینا • کە تەماشام کرد زانیم سبیلی تووتن کێشان نیە ، بەڵکو دەمانچەیە •

پاش ماوەیێ مێردەکە هەڵسا و چوە دەرەوە بۆ ئەوە کە لە دەرگاکەی‌تری بچێتە ماڵی دووەم • ئافرەتە بەسەزمانە نەخۆشەکە شەو هەتا بەیانی هەر نرکە نرکی بوو و لەبەرخۆیەوە «وەی نەنە ، وەی نەنە»ی دەگوت • لەگەڵ ئەوەشدا من رازی نەبووم و قەبووڵم نەکرد چوارپایەیێکی ئاسنیان بۆ من تەرخان‌کرد و من لەسەری هەتا بەیانی بە خۆشی نووستم •

شەوی پێشوو لە هەولێر لە ئوتێل بە خراپی نووستین • ئوتێلەکە چەند ژووری هەبوو و لە دەرەوەی حەوشەکە چوارپایەکانیان لێ‌دانابوو • لەم ئوتێلە بێجگە لە ئێمە ئافرەتی دیکە نەبوون و حەوشەکە بۆ پیاوان تەرخان کرابو • لەبەرئەوە دەربەست‌بووین لەناو یەکێ لە ژوورەکان لەگەڵ تەرجومانەکەم و برا بچووکەکەی بنوین • لەگەڵ ئەوەشدا ژوورەکە پانکەی هەبوو ، ئەوەندە گەرم بوو زۆر بە ناخۆشی توانیمان نەختێ بخەوین •



— ١٠ —

# گونــدی بێ ئــاو

لەسەر زۆری سەربانەکانی سولەیمانی لەقلەق هەن • ئەم باڵندانــە بە کوردی لەقلەقیان پێدەوترێ لەبەرئەوە کە بە دەنووکیان دەنگێ دەردەکەن کە لە دەنگی وشەی لەقلەق دەکا • ئەم باڵندانە ــ کە هەندێ جار بە بــاڵە پانەکانیانەوە بە نزمی دەفڕن ــ دەبنە بەشێ لە دیمەنی ئەم شارە و دەور و پشتی ، هەروەکو داری گوڵەبەڕۆژە جوانەکان کە باغ و حەوشەکــانی دەڕازێننەوە • من بیرم لەوە دەکردەوە کە ئەم باڵندانە بە خواردنی بــۆق و گیاڵەبەری بچووکی ئاو دەژین و دەبێ بچن بۆ ناو ئاوێکی نزیك بۆئەوە کە خۆراکەکەیان بدۆزنەوە •

**سەرچنــــار**

نزیك سولەیمانی سەرچنار هەیــە کە ئاوێــکی زۆری لێ دەڕژێ و

سەرچاوەی ئاوی شاری سولەیمانیە و لە نزیکی کارخانەییەکی گەورەی چیمەنتۆ دروستکراوە .

لە سەرچنار کە چەند سەرچاوەی سارد یەکدەگرن و دەرژێن دار و درەختێکی زۆر رواون ، حەوز و دەور و پشتەکەی رێکخراوە و خانوو و گازینۆ ئامادە کراوە و بوەتە سەیرانگا . خێزانەکان لە سولەیمانی و شارانیترەوە دەتوانن بە قەمەرە و پاس بۆ ئەوێ بچن و رۆژێ هەتا ئێوارە لەژێر سێبەری دارەکان و لەتەنشت ئاوە ساردەکە رابوێرن و بە هەستی شنەی بای فێنك و خوڕەی ئاوی سارد دڵیان بکرێتەوە . لە خانوە هاوینیەکان نە کورسیم دی و نە مێز . چونکە لێرە خەڵك کە هاتن لەسەر بەڕە لەسەر زەوی دادەنیشن . خێزانەکان قەمەرەکانیان هەتا دەمی بە گەورە و بچوك پڕ دەکەن و هەمووشتێ ــ کە بۆ ئامادەکردنی چای و خواردنی نیوەرۆ پێویست بێ ــ لەگەڵ خۆیان دێنن . ئەم خێزانانە چێشتی لێنراو بەدەگمەن لەگەڵ خویان دەهێنن . لەبەرئەوە ئەمانە سەماوەر ، خەلوز ، قاپ و ئامان بۆ چێشت لێنان و گوشت و برنج و نان و شەکر و چای لەگەڵ خویان دێنن [١] .

ئەم سەیرانە خۆشەی کورد لە سەیرانی ئێمەی ئەورووپایی دەکا کە لەناو باغە تایبەتیەکان (پارکەکان) دەیکەین ، ئەو باغانە کە بۆ سەیرانکەر تەرخان کراون و بۆ دانیشتن مێز و تەختی لەناو بڵاو کراوە .

ئەم جۆرە سەیرانگایە بە شتێکی خۆش دادەندرێ . لەبەر ئەوە لەپاش مردنی کەسوکارێ ، لە کاتی پرسە نابێ تۆ بۆ ئەوێ بچی .

---

(١) نووسەر ئەوەی نەزانیوە ئافرەتی کورد وا حەز دەکا لە جێگای سەیران چای بکا ، چێشت لێنێ ، تەنانەت هەندێ جار ــ بێتو لادێیی بێ ــ نان بکا .

وەرگێر

ئاو و داری سەوز لە وڵاتێکی وشك دەبێتە هۆی دیمەنێکی زۆر جوان • ئاو بەتەنیا ژیانە [۱] • ئاخ (واتا خۆڵ) لێرە لە زۆر شوێن بە پڕشتە و بە پیت و بەرەکەتە • بەڵام زۆری ئەو شوێنانە ئاویان نیە • هەندێ جار لە شوێنێ ئاوێك وشك دەبی ، یان ئاوی چەمێك وردە وردە کەم دەبێتەوە • ئەمە دەبێتە هۆی ژیانی تاڵ ، کولەمەرگی و ماڵوێرانی بۆ ئەوکەسانە لەوێ دەژین •

## میرزا ڕۆستەم

من جارێ چەند ڕۆژێ لە دێی میرزا ڕۆستەم رامبوارد کە لەسەر زێی بچووك بوو ، لەو جێگایە کە قایغ خەڵکی لەلایێکەوە بۆ لایێکی‌تری زێ دەپەڕاندەوە [۲] • لە بەردەمی دەشتایی و لە پشتی شاخ هەبوو • ئاوەکە لەوێ لەبەر گەرمای هاوین ئەوەندە کەم بووبووەوە زیخ و چەو لە هەردو قەراغ بە وشکی کەوتبوە دەرەوە • بەیانی‌یێك هاتمە خوارەوە بۆسەر ئاوەکە • پێم‌ڕووت کرد و لە ئاوێکی بچووکی تەنکم دا ، لەپاشان ئیتر کەوتمە سەر زیخ و چەو • من مەبەستم لەو سەفەرە ئەوە بوو بزانم ئافرەتێکی میرزا ڕۆستەم بۆ هێنانی ئاو بە تەنەکە چەند هەنگاو دەهاوێ • ئەودەمە دوارۆژەکانی حوزەیران بوو • ئافرەتێك دەبوایێ بۆ هێنانی ئاو سێ‌سەد هەنگاو بڕوا تاکو بگاتە سەر ئاوەکە و سێ سەد هەنگاویش دانێ بۆئەوە کە تەنەکە ئاوەکە لەسەر شانی بۆ ماڵەکەی بهێنێتەوە • ئەو ماڵە کە لێی دەژیام نزیك‌قەراغی زێ بو • من چەند جارێ چاوم لە ئافرەتەکان

---

(۱) کوردەکان لە ئاو وشەی «ئاوەدانی»یان دروست‌کردوە و لە گەرمیان بە گوند ، دێ دەڵێن «ئاوایی» .

**وەرگێر**

(۲) ئێستا ئەم دێیە نەماوە . جێگاکەی نوقوم بوە لەژێر بنەوانی دووکان .

**وەرگێر**

بوو کە بۆ ئاو دەچوون • کە دەگەیشتنە سەر ئاوەکە پێڵاوەکانیان دادەکەند و تەنەکەکەیان دەبردە ئەوبەر و پڕیان دەکرد و دەیانهێنایەوە ئەمبەر • ئینجا پێڵاوەکانیان لە پێ دەکردەوە و سەردەکەوتن بۆ ناودێ و دەچوونە ماڵەکەیان • هەندێکیان ماڵیان دوور بوو ، لەوپەڕی دێیەکە بوو • لەبەرئەوە بە بارە قورسەکەیانەوە دەربەست بوون ماوەیێك پتر (واتا زیاتر) برۆن • ئینجا چۆن تەنەکەیێ ئاو بەشی خێزانێك دەکا بۆ خواردنەوە ، چێشت لێنان و شۆرین • کچێ شۆرینی چی ؟ بەخوا لەورۆژە گەرمانەی دوای حوزەیران زۆر کەم دەیانتوانی دەس و دەموچاوی خۆیان بشۆن •

باغەکانی سەر زێ بە چەرخ ئاودەدرا ، قاترێکی چاو بەستراو چەرخەکەی دەسووڕاند و ئاوەکە دەرژایە ناو جۆگاییەکی بچووکەوە • بەڵام ئاوی ماڵ بە شانی ئافرەتان دەهێنرا • کە گەرما بەرز دەبوەوە ، ئەم ئاوە کەمی دەکرد •

لەوماڵە کە دەژیام لە دێی تۆپزاوە ــ واتا لە ماڵی شێخ ــ بەجۆرێکی باشتر ئاویان بۆ سەرەوە دەهێنا • لەوێ بە گوێدرێژ ئاویان دەهێنا کە ٦ ــ ٧ بەرمیلی بەتاڵیان لێ بار دەکرد • بەرمیلە پڕکراوەکانیان لەسەرەوە ڕۆدەکردە ناو تانکیێکی گەورە کە لە خوارەوە بەلووعەی هەبوو • من دەمتوانی لە بەلووعەکە بە ڕەحەتی دەس و دەم و چاوم بشۆم • جارێك ئەسپێ کە بە دان کەوتبوو بۆ چاوەدێری لای تانکیەکە بەسترابوەوە • کە چووم دەستم بشۆم ، کلکی هەڵگرت و لێی دام و ئەوەندەی نەمابوو بمخاتە خوارەوە بۆ سەر زەوی •

لە میرزا ڕۆستەم یەکەم جار بوو بە نوێنێکی تازە دەنووستم • لە تۆپزاوە نوێنی تایبەتی خۆم هەبوو لە ژووری خۆم • بەڵام لێرە یەکەمجار بوو لەگەڵ ئەندامەکانیتری خێزانێك لەسەر نوێنێکی تایبەتی دەخەوتم • نوێنەکەم لە حەوشە بوو • لەبەرئەوە بیرم لەوە دەکردەوە چۆن ئێوارە

جلەکانی رۆژم بگۆرم و جلی شـەو لەبەرکەم • بەڵام ئێوارە بە تاریـکی هەرچۆنێ بوو توانیم جلەکانم بگۆڕم • کە بەیانی لە خەو هەڵسام دەور و پشتم هەموو هەڵسابوون • ئیتر چۆن دەمتوانی لەناو ئەو خەڵکە جلەکەم بگۆرم !! ئیتر بۆ جارێکیتری وەك ژنە لادێییەکان بە باشترم زانی هەر بـە جلەکەی رۆژمەوە بنووم تاکو بەیانی دەربەست نەبم بیگۆڕم •

بەڵێ لە میرزا رۆستەم ژنان رۆژی چەند جارێ ئاویان بۆ ماڵ دەهێنا • بەڵام خوا و راستان رێگاکەیان راست بوو • بەرزی و هەورازی نەبوو • بەڵام لە دێیێکیتری ناوچیاکان کە ناوی (بەلخە)یە رێگای ئاوەکە ناخۆشە و هەورازێکی خراپ دەکەوێتە سەر رێگا • یەکێ لە ماڵەکان لەم دێیە کـە سەرمان لێ دا ماڵی مەلا بوو • مەلاژن بە گەرمی گلەیی لە ئیشی ئاوهێنان دەکرد و دەیگوت : «بەخوا ئیتر من بەرگەی ئەوە ناگرم رۆژی سێ چوار کوندەئاو لە خوارەوە بۆ ماڵەوە سەرخەم • لە سەرەوە رێگاکە هەورازە و هێنانی کوندەئاوێك هیچ نەبێ نیو سەعاتی پێدەوێ » •

لە سولەیمانی پیاوێك هاتە ماڵی خانەخوێکەم کە خەڵکی بەلخە بوو• وادیارە خێزانی خانەخوێکەم پەیوەندییان لەگەڵ زۆر کەس لە سولەیمانی و دەرەوەی هەبوو • پیاوەکە لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا گەنج بوو ، ماندوو و پەرپووت دیاربوو • رانك و چۆخەکەی ــ کە لە مووی بزن تەنرابـوو ــ کۆن و چڵکن بو • دوو کەری پێ بوو بە تووی وشکی ناو پێستە بـاری کردبوون • دەیویست لە بەلخەوە بچێ بۆ گەرمیانی کەرکووك و لەوێ توە وشکەکەی بە دانەوێڵە بگۆڕێتەوە • لەسەر رێگا لە سولەیمانی پشووی دەدا • سەفەرەکەی دوو هەفتەی دەخایاند و ناخۆش بوو • لەرێگا بە کوێ بگەیشتایێ لەوێ ڕادەکشاو دەنووست •

**چوون بـۆ بەلخە**

پاش ماوەیێك ئێمە بۆ سەردان چووینە بەلخە و لە ماڵی ئەو پیـاوە

دابەزین کە ژنێکی هەرزەکاری هەبوو • لەوێ لە سەربان لەسەر بەڕە و دۆشەك دانیشتین • لەپاشان خەبەرمان بۆ هات کە دەتوانین بۆ ماڵێکی‌تری بچین کە ژوورێکی پرفەرشیان هەیە • ماڵێك ژووری پڕفەرشی هەبێ مەعنای وایە ئەحواڵیان باشە و دەسیان دەڕوا • بەڵێ لە ژووری پرفەرش دانیشتن و رابواردن خۆشترە • بەڵام ئێمە چۆن خانەخوێیە باشەکەمان بەجێ‌دەهێڵین• قسەی پێ ناوێ ئێمە لەوێ ماینەوە •

بۆ بەخێرهاتن کردنی ئیمە پیاوە ناودارەکانی دێیەکە ئێوارە هاتنە لامان • ئەوەندەی پێ‌نەچوو سەربانەکە بە بۆرە پیاو پڕ بوو کە دەورەی ئێمەیان دا و جغارەیان دەکێشا و چاییان دەخواردەوە • رۆژی دووەم ژنان هاتن • ژمارەی ئەمان لە هیی پیاوەکان کەمتر نەبوو •

من یەکەم ژنی ئەورووپایی بووم لەو دێیە • ژنەکان بەسەیرەوە تەماشای پرچیان دەکردم کە بەسەر ملما شۆڕ بووبووەوە • لەپاشا لەم دێیە چاوم بە چەند منداڵی قژزەرد و چاوشین کەوت ، بەڵام رەنگیان وەك رەنگی منداڵانی ئەورووپای باکوور (واتا شیمال) زۆر سپی نەبوو •

ئێمە دوو شەو لە بەڵخە ماینەوە • خانەخوێکەمان باشترین دۆشەکی لە سەربان لەسەر بەڕە بۆ راخستین • تەرجومانەکەم و من هەریەکە لەسەر دۆشەکێ نووستین • بەڵام هەردو دۆشەکەکە لەتەنیشت یەکەوە لەسەر یەك بەڕە راخرابوون • پاش نیوەڕۆ بەرەو دوشەکەکان بە وڵاغ بارکراو و برانە ناو باغ و لەژێر دارتوەکان راخران • ئەم خێزانە چاکە کە دەسیان باش نەدەڕۆیی ئەوەندەی پێیان کرا خزمەتیان کردین و ئامادەبوون ئەوەی هەیانبوو لە بەردەممان داینێن • کە جیابووینەوە ملوانکەیێکی مووورووی سپیم هەبوو کردمە ملی ئافرەتەکە • ئەو ملوانکە هەرزانەم لە بازاڕی سولەیمانی کڕیبوو ، داخەکەم لەوە زیاترم پێ‌نەبو • چەندی حەزم دەکرد

شتێك لەوە باشتر و نایابترم هەبوایێ تاکو بەرامبەر مێوانداریە باشەکەیان پێشکەشم بکردایێ • بەلام داخەکەم هیچیتری ئەوتۆم پێ نەبوو •

**باغەکانی بەلخە**

باغی دارتوەکان فێنك و خۆش بوو • سەرزەوی و ژێردارەکان تەخت و پاك کرابوون و بە بەرد لووس و جوان کرابوو بۆئەوە کە دەنکە توەکان کە کەوتنە سەری بە پاکی و پوختەیی بمێنن • توە سپی و زەردەکان دەکەوتنە خوارەوە ، ژنان کۆیان دەکردەوە و دەیانبردە جێگایێکی تایبەتی بۆ وشك کردن • ئەم جێگایەش بە قوڕ تەخت و بە بەرد لووس کرابوو • ئەو سەربانەش کە شەوان لەسەری دەنووستین بە هەمان جۆر تەخت کرابوو • قوڕەسوورەکە بە چینێ قوڕی سپی سواغ درابوو و لەپاشان بە بەرد باش لووس و جوان کرابوو • نەدەبوو ئاو بڕشێتە سەر ئەم سەربانە پوختەیە بۆئەوە کە تێك نەچێ • بێتو نەختێ چای یان ئاو بڕژایەتە سەری زوو بەهۆی بەردێك ـ کە هەمیشە ئامادە بوو ـ لووس دەکرایەوە • لەپاشان هەموو سەربانێ سالی جارێك دەبوایێ قوڕەکەی تازە و تەخت و لووس بکرێ •

لەخوار سەکۆی دارتوەکان سەرچاوەیێك هەبوو • لەپاش ئەوە گەیشتینە ناو باغەکان لەوکانیە ـ بە بێ داواکردنی ئێمە ـ تاسێ ئاویان بۆ هێناین • لێرە لەناو مالەکانی کورد کە گەیشتیە جێ کوتوپڕ ئاو ، دۆ یان ماستاوت پێشکەش دەکرێ • ئەمە تەنیا لەبەر گیانی مێوانداری و چاوتێری نیە ، بەلکو لەبەر گەرمی و وشکی هاوینی ولاتەکەشە • لەبەرئەوە تۆ زۆر توونیت دەبێ و شکاندنی توونیەتی دەبێتە خزمەتێکی گرنگ و گەورە •

**نانکردن لەناو باغ**

ژنەکەی خانەخوی « ئافرەتی مالەکەم » لەگەل مندالە سێ سالانەکەی

که خستبوویه سەر پشتی کیسەیێك ئارد و هەندێ خوێیهێنابوو لەناو کیسەیێکی بچووك بۆئەوە کە لەناو باغەکە لەژێر دارتوەکان نانی ساجی بکا • لەوێ لە باغەکە هەموو تفاقی نانکردن هەبوو •

لەپێش هەموو شتێکا چوە سەر کانی بۆ خۆ شۆرین • چونکە لە ماڵەکەی لەناو دێ ئەوەندە ئاو نەبوو خۆ بشوا • لەپاشان سەرپۆشە سپیەکەی لەسەر کڵاوەکەی قایمکرد • لێرە ژنان فێس لەسەر خۆیان نانێن تەنیا کڵاو لەسەر دەکەن کە هەندێ پارەی زیو و مووروی پێوە دووراوە • لەپاشا فەقیانەکانی کردەوە و نوێژی کرد • لەپاش نوێژ کردن کوندەیێك ئاوی هێنا و هاتە لای کوانووی ئاگرەکە لەژێر دار تووێك • کوندەکەی لەلایێکەوە بە دەم بەستراوی و ساجەکەی لە بان کوانوەکە لەسەر سێ کوچکە دانا و هەندێ چیلکە و گەڵای هێنا و لەناو کوانوەکەدا ئاگری کردەوە • ئینجا ئاردەکەی بێژا و لەناو تەشتێکی مسی سپیکراو هەویری شێلا • لەپاشان گوندکی هەویر دروستکراو خرایە سەر پنەیێکی نزمی بچووك ، پان کرایەوە و خرایە سەر مادە و لەپاشان سەر ساجەکە کە لەسەر ئاگرەکە گەرم بووبوو • بەمجۆرە دەسکرا بە برژاندنی نانی ساجی • هەویرەکە لەناو تەشتەکە وردە وردە کەمبوەوە • سەبەتەی نانەکەش وردە وردە بە نانی ساجیی تەنکی جوان بەرزبوەوە • ئافرەتەکە هەمیشە لەژێر دارتوەکە بە چوار مەشقی دانیشتبوو ، تەنیا پەنجەکانی و دەسەکانی دەجووڵایەوە و ئیشەکەی زۆر بە رێکوپێکی ، زیرەکی و وەستایی جێبەجێ دەکرد •

رۆژی دووەم چووینە سەر تاقگەکەی خوار ئاوایی • لەوێوە ئاوی خواردنەوەی پاك بۆ ئاوایی دەبرا • ئاوەکە کە لەقەد شاخەکە بە گژوگیا داپۆشرابوو بڵقی دەدا و دەرژایە خوارەوە • لە تەنیشتنیەوە حەوزی خۆ

شتنی ژنان هەبوو • لەپاش ئەوە کە پیاوێك و چەند کوڕێ کە لەوێ بوون دوورخرانەوە ، چووینە سەر ئاوەکە • لەوێ ژنەکەی خانەخوێ دەست و قاچی و هەندێ لە جلەکانی شۆری • نەختێ لەولاوە چەند ژنێ کوندەکانیان بە ئاو پردەکرد و دەیانخستنە سەر پشتیان • پارچە بەرمالێکیان دەبەستە سەرشانیان و کوندە قورسەکانیان بە دانیشتنەوە دەختە سەر پشتیان • ئینجا هەڵدەستان و دەسیان دەکرد بە هەورازەکەدا سەرکەوتن • ڕێگاکە دوور بوو و بۆئەوەی لە تاڤگە جوانەکەوە بگەنە ناو دێ نیو سەعاتی دەخایاند •

دێی بەڵخە دەکەوتە پاڵ شاخێکی لێژ • لە خواریەوە کانیێکی گەرم هەبوو کە خانوێکی قوڕینی چلکنی لەسەر دروستکرابو • بەڵام ئاوی ئەم کانیە بۆ خواردنەوە و چێشت لێنان بەکەڵك نەدەهات • لەوێ ژنان دەیانتوانی تەنیا ئامانەکانیان و جل بشۆن و دەسنوێژ هەڵگرن •

لێرە ژنان لە تەختکردنی سەربان کۆمەکی پیاوان دەکەن • کە پاش نیوەڕۆ شوان مێگەلی هێنایەوە ژنان بۆ دۆشینی بزنەکان دەچن و شیرەکە دەکەنە ناو مەشکەوە •

بەڵام وادیارە لێرە بیریان لەوە نەکردوەتەوە لەباتی ئەوە ژنان بەکوندە ئاو بێنن و ساڵ دوانزەی مانگ تووشی ئەو دەردەسەریە بن ، بە ولاغ و بەرمیل ـ وەك لە دێی تۆپزاوە ـ ئاو بێنن • ئەم ئیشە کە ژنان دەیکەن زۆر گران و ناخۆشە و ژیانێکی کولەمەرگیە •

لەم دێیە ژنان دەبێ زۆر ڕەنج بدەن و زۆر ماندوو بن • چونکە ئاو و هەوای دێیەکە فێنکە ، ژنان پاش نیوەڕۆوان نانون • هەر لە بەیانی زووەوە دەبێ ڕەنجبدەن و خەریکی ئیش بن هەتا ئێوارەی درەنگ • سەرەرای ئیشی ماڵ دەبێ ژنان لە باغەکان خەریکی کۆکردنەوە و وشككردنی تووش بن •

لەناو باغەکان کە کچەکان لە منداڵیەوە ئیش دەکەن ، لە تەمەنێکی زۆر بچووك بە دوانزە ساڵان بەشوویان دەدەن • هەندێ کچی بچووکی کڵاو لەسەرم دی کە پارچەی زیویان پێوە کرابو و وا دیار بوو شوویان کردبوو •

کچێکی‌تری ئەم دێیەم لە گوندێکی‌تری دی کە لە تەمەنی دوانزە ساڵی بەشوویان دابوو • بۆیان گێڕامەوە کچەکە ئەوەندە بچووك دەبێ ناتوانێ خۆی بە بووکی لەسەر ئەسپ رابگرێ • لەبەرئەوە یەکێ سواری ئەسپەکە دەکەن تاکو بیگرێ و نەکەوێ • ئەو کچە بەسەزمانە بەختی رەش دەبێ • چوار منداڵی دەبێ ، دوانیان دەمرن ، دوانەکەی تریش کچ دەبن • لەگەڵ ئەوەشدا جوان و شیرین و ژیکەلە و ئێسك سووك بوو دەیتوانی ئیشی ماڵ ئازایانە جێبەجێ بکا ، مێردەکەی هەڕەشەی لێ دەکرد کە ژنی بەسەر دێنێ • بۆ ؟ بۆئەوە کە کوڕی ببێ • بەڵام ئەم کچە بڕیاڕی دابوو بەم کردەوەیەی مێردەکەی نابێ رازی بێ و دەبێ ژیانی هەوێکەی و مێردەکەی تاڵ کا • بەڵام ئەم جۆرە بڕیارانە لێرە ئەنجامی خراپ دەبێ ، چونکە مێردەکە لەوانەیە ژنە کۆنەکەی بنێرێتەوە ماڵی باوکی یان تەڵاقی‌دا •

ئێمە لەم گوندە بێئاوە دوو شەو ماینەوە • شەو دەمانتوانی بە رەحەتی لەسەر بانە تەختە جوانەکە بخەوین ، بەڵام گۆزە ، مەسینە یان دۆڵکەی ئاویان نەبوو کە دەستی پێ بشۆی • نابێ ئێمە لەمە گلەیی بکەین، چونکە دێیەکە ئاوی کەم بوو •

لەم دێیە سەربانەکان بەیەکەوە نووساون و بۆئەوە کە سەگ یان زیندەوەری چوارپێی‌تری بۆ سەربان نەیێن پەرژینێکی دڕکیان دادەنا لە بەینی سەربانەکان • جارێکیان بە شەو لە سەربانەکەی تەنیشتمان لە

ولاغ باریان دادەگرت و دەنگەدەنگ پەیدابوو • لەپاش ئەوە هەرکەسێ لەژێر لێفەکەی هەتا بەیانی کپ بوو •

بەیانی درەنگ بە پێ بۆ سەرشەقامی ئۆتۆمۆبیل کەوتینەرێ • لەوێ لە چایخانەیێکی خۆش لەژێر سێبەری دار چاوەڕێی پاسمان کرد کە بمانگەیێنێتە سولەیمانی •



## - ١١ -

# نەخوێنـدەواری

هەستێکی زۆر ناخۆشم پێدەدا کە دەزانم ئەو ژنانە کە نـاسیمن و لەگەڵیان ژیام ناتوانن قاقەزم بۆ بنووسن • لـە دێنمـارك لە ماڵـەوە زۆر حەزمدەکرد بۆ دۆستەکانی کوردستانم قاقەز بنووسم ، بەتایبەتی بۆ ئـەو ئافرەتانە کە لە ماڵیان ماوەییێکی درێژ ژیام •

من ناتوانم بۆ ئەو ئافرەتانە قاقەز بنووسم کە دەزانم نەخوێندەوارن و ناتوانن قاقەزەکانم بخوێننەوە • تەنیا پارچە قاقەزێ کە نـاوی منی لەسەر بێ ئەوان سەری لێ دەرناکەن و هیچی لێ تێناگەن • لە کوردستان فێرگەی (واتا مەکتەبی) کچان زۆر نییە • لە سولەیمانی یەکێك هەیە • تەرجومانەکەم کە لە کۆلێژی بەرزی مامۆستایان دەرچوە و مامۆستاییێکی باشی ئینگلیزیە و لە فێرگەیێك دەرس بە کچان دەدا ، خوشکەکانیشی چوونەتە فێرگە، بەڵام ئەمانە جیاوازن •

له زۆری گوندەکان فێرگەی سەرەتاییش بۆ کوڕان نیـــە • له زۆر ئاوایی که سەرم لێدا فێرگه نەبوو • وا بڕیار دراوه له زۆر جێگا فـێرگه دامەزرێ • بەڵام کەمی مامۆستایان ئەم پرۆژەیه دوادەخا • ئەو ژنانه کـــە نـــاسیمن هەموو ئێستا گەورەن و به منداڵی کەس بیری لەوه نەکردوەتەوه فێری خوێندەوارییان بکا [1] •

ژیاری (واتا حەضارەتی ، کەلچەری) کوردەکان له بنەڕەتــدا له هیی ئێمەی ئەورووپا جیاواز نیه • ئەوان موسوڵمـــانن و دینی ئیسلام داوای خوێندەواری دەکا و پەسەندی دەکا بۆئەوه که قورئـــانی پیرۆز بخوێنن و تێ‌بگەن و ئاگایان له دینەکەیان بێ • زۆربەی کوردەکان له دێهات وەك فەلاحەکانی ئێمەی جاران دەژین و له تێکنۆلۆجی دوورن • جل و بەرگیان بەتایبەتی له دێهات بەدەگمەن دەگۆڕن ، دایك چی لەبەرکرد ، کچەکەشی ئەو جۆره بەرگه دەپۆشێ • بەڵام هەر هەرێمێ جل و بەرگی تایبەتی خۆی هەیه • له شاران مۆده هەیه و هەندێ له ئافرەتان جلی خۆیان بەپێی مۆده دەگـــۆڕن [2] •

---

(۱) ئێستا له کوردستانی عێراق له زۆربەی گونـــده گەورەکان فـــێرگەی سەرەتایی هەن . له هەندێ شوێن له گوندێـــکی نـــاوەند فێرگەیێـــکی سەرەتایی هەیه که منداڵی گوندەکانی دەوروپشتی بۆ ئەوێ دەچـــن . لەپاشان له زۆری ناوچەی ناحیەکان فێرگەی ناوەندی (متوسطة) و لـــه قەزاکان فێرگەی ئامادەیی (اعدادیه) هەن . فێرگەی کچانیش ئێستا لـــه شاران زۆرن و له ناحیه و قەزاکانیش هەن . لـــه هەنـــدێ لادێ لـــه فێرگەی سەرەتایی کوڕ و کچ پێکەوه دەخوێنن . کچ و ژنی خوێندەوار ئێستا له کوردستان زۆرن و له زۆر جێگای کوردستان ئێـــستا فێرگەی تایبەتی کراوەتەوه بۆ قەلاچۆکردنی نەخوێندەواری و لەوێ خوێندن و حیســاب فێری پیاو و ژن دەکرێ .

**وەرگـــێڕ**

(۲) مۆده پەیوەندی لەگەڵ بازرگانی دنیا هەیه . زۆری ئـــەم مۆدانـــه لـــه نیویۆرك یان پاریس پەیدا دەبێ . مەبەستیان لەم مۆدانه ئەوەیه هەموو

کوردەکان قژ و چاویان وەك خەلکی باشووری ( واتا جەنووبی ) ئەورووپا رەشە ، هەندێکیان قژیان زەرد و چاویان کاڵە یان شینە • زمانەکەشیان وەك زمانی ئێمە زمانێکی هیندی ـ ئەورووپاییە •

لەبەرئەوە من لە هەموو جێگایێ زوو دەبوومە دۆستی ئافرەتان و بە خۆشیەوە منیان لە ماڵی خۆیان قەبووڵ دەکرد • هەر لەبەرئەوەیە من ئێستا هەست بە ناخۆشی دەکەم کە ناتوانم قاقەزیان بۆ بنووسم • من حەزم دەکرد قاقەزیان بۆ بنووسم و سوپاسیان بکەم بۆئەوە کە بە شکاندنی دەستووریان لە هاتوچۆ کردنی مالیان چاوپۆشییان لێ دەکردم و لێیمدەبووردن • لەپاشا من حەزم دەکرد داوای لێبووردنیان لێ بکەم کە بە ناشیرینی دادەنیشتم لەوکاتە کە ژنەکانیتری وەك گولی قەنەفل لەسەر زەوی دادەنیشتن و دەلەرینەوە • لەپاشان چەندێ حەزم دەکرد داوای لێبووردنیان لێ بکەم لەوە کە لەسەر نەریتی (واتا دەستووری) ئەورووپاییەکان من ڕاست داوای خواستەکەم دەکرد و حەزم دەکرد زوو خواستەکەم بێتەجێ • من ئێستا دەلێیم ئەو چەشنە رەوشتەی من جوان نەبوو ، گەوجانە و بێئەدەبانە ، رەق، پریمیتیڤ Primitive و ناشیرین بوو •

بێتو لە بازاڕ بۆ کرین یان بۆ دیدەنی کەسێ بچوومایێ دەبوایێ لەسەر نەریتی ئەو شوێنە بجوولێمەوە • لێرە پەیوەندی ناو خەلك وەك لای ئێمە لە ئەورووپا راستەوخۆ نیە بەلکو پێچاوپێچە ، ئالۆزە و گرێدراوە وەك کێ دەبێ لەگەڵ کێ قسە بکا و بۆ دیدەنی کێ بچێ ... ئەمانە هەموو

---

سالی مودەیێکی تازە بەیدا بێ ، تاکو ژنان ـ بۆ وێنە ـ کراسی تازە دروستکەن و کراسە کۆنەکانیان ئیتر لەبەر نەکەن ، بەهۆی ئەمە بازرگانەکان دەتوانن زۆرتر کووتاڵ بفرۆشن . لەپاریسەوە مۆدەکە دەگاتە بێرووت ، لەوێوە بە رێگای بەغدادا دەگاتە سولەیمانی و هەولێر و دهۆك .

وەرگێر

دەوەستێتە سەر نەریتی با و باپیران و وەچەکانی (واتا اجیالی) پێشوو • لێرە تۆ دەبێ هەمیشە بیر لە ڕابوردوو بکەی و بەپێی نەریتی رابوردوو ــ وەك لە ئەورووپا لە سەدەی هەژدەمین لەکاتی Rococe (١) نەك ئێستا ئەم رۆژە ــ بەڕێوەبچی •

ناوبانگی چاوتێری و پیاوەتی دەرکردن لێرە چەند پشتێکی دەوێ • پەیوەندی خێزانەکان بەهۆی ژن و ژنخوازی زۆر بەوردی دادەمەزرێ • لای ئێمە تەنیا لەناو خێزانی پاشاکان و قڕاڵەکان بۆ دامەزراندنی پێوەندی خزمایەتی ئەم جۆرە وردبینیە هەیە • ناوبانگی مرۆڤ شتێکی زۆر ناسکە و دەبێ پیاو ئاگای لێ بێ • لێرە مرۆڤ دەبێ لەپێش ناسینی کەسێ ئاگای لە پەیوەندی ئەوکەسە بێ لەگەڵ خێزانەکانیتری و بزانێ خزمەکانی کێن • لەئەورووپا خەڵك مرۆڤ دەناسن و بەس و بیر لە کەسوکاری ناکەنەوە و هەقیان بە کەسوکار و یاریانەوە نیە •

## داواکردنی کچ بۆ مارەکردن

لە سولەیمانی لە داواکردنی چەند کچێ حازر بووم • کوڕێکی جاهێل هەبوو کە لە تەمەنا بچووك نەبوو و ئەوەندە پارەشی کۆکردبوەوە کە بەشی تفاقی ژنێك بکا و ئامادە بوو پێنجسەد دینار بۆ ئەم ژن هێنانە دانێ •

---

(١) Rococe زاراوەیێکە لە چواریەکی یەکەمی سەدەی هەژدەمین لە فرانسە پەیدابوو و پەیوەندی لەگەڵ Baroque هەیە . ئەمیش جۆرە هونەرێکە لە سەدەی حەڤدەمین لە ئەورووپا پەیدابوو و لە تەرزی دروستکردنی خانووی گەورە و قەسر دەردەکەوێ .
چاپی ١٩٤٧ی ئینسیکلۆپیدیای بەریتانیایی Encyclopaedia Britanica
وشەی Rococe بەپێی فەرهەنگی ئۆکسفۆرد Oxford ی ئینگلیزی کە گرنگترین فەرهەنگی ئەم زمانەیە Rococe واتای شت و نەریتی کۆن دەگرێتەوە .

**وەرگێر**

لەبەرئەوە رۆژێ لە ئافرەتەکانی ماڵەکەی پرسی ئایا خێزانێکی باش دەناسن کچێکیوای هەبێ لە تەمەندا بۆ مارە کردن بگونجێ • من لەوکاتە لەو ماڵە بوم و چاوم لێ بوو کوڕەکە بە پسەپس خواستە ناسکەکەی بە ئافرەتـانی ماڵەکە دەگەیاند • لەم حاڵە کوڕەکە دەربەست نەبوو (واتا مەجبوور نەبوو) ماڵی باوکی بەجێبهێڵێ چونکە ماڵەکە گەورە بوو و ژووری زۆر بوو و بووکێکی جاهێڵ جێگای تێدا دەبوەوە • لەو ماڵە هەموو رۆژێ بۆ ١٥ــ١٦ کەس چێشت لێدەنرا • یەکێ زیاتر بوایە ئەمە مەسرەفی ماڵەکەی تێکنەدەدا• ژنانی ماڵەکە بەلکو پێیان خوش بوو کچێکی هەرزەکار بێتـە ناویان کـە دەبێتە هۆی پەیدابوونی دوو دەستی زیادە کە لە ئیشوکاری ماڵ کومەکییان دەکا •

خوشکە گەورەکەی کوڕەکە لەگەڵ ژنە بچووکەکەی باوکی ، واتـا بـاوەژنەکەی ، بەلینیان دا لەمبابەتەوە شتێکی بۆ دەکەن • دایکی خـۆی کە ژنی گەورەی باوکی بوو وا دیار بو پێینەدەکرا ئەم جۆرە کارە ناسکە جێبەجێ بکا • خوشـکە گەورەکەی چاوی لە هاورێیێکی یەکێ لە خوشکە بچووکەکانی بوو کە دەیگوت هەم چالاك و هەمیش بەئەدەبە • ئەمە مەعنای ئەوەبوو کچەکە رووخۆشە و لەوانەیە باش لەگەڵیان بگونجێ • کوڕەکـە جارێك کچەکەی دیبوو کە هاتبوە ماڵیان • کچەکەش جارێك چاوی بـە کوڕەکە دەکەوێ و دەلێن ئەوە برای کچە هاورێکەیەتی • بەلام کەسیـان لەگەڵ ئەویتری قسەی نەکردبوو •

بەلام خوشکە گەورەکە و باوەژنەکە بەتەنیا نەیاندەتوانی بۆ داخوازی بچن • من نەمدەتوانی لەگەلیـان بچم بۆئەوە کە ناوبـانگیان بەرزکەم و لەسەریان بکەمەوە • بەلام لەگەلیان چووم بۆئەوە کە لەم جۆرە دەستوورانە (نەریتانە) ئامادە بم و بزانم کوردەکان چۆن لە داخوازی گفتوگۆ دەکەن و چۆن ژن دێنن • لەبەرئەوە ئافرەتێکی ناسیاویان پەیداکرد کە مێردەکـەی

زۆر دەوڵەمەند بوو • ئافرەتەکە سەر و ملی باش بە زێڕ رازاندبوەوە و تکایان لێ کرد کە بۆ داخوازی لەگەڵیان بێ بۆئەوە کە کولەکەیێکی ئابووری و کۆمەلایەتی بخاتە بەر داخوازیەکەیان • ئەویش قەبوولی کرد •

بەمچەشنە سێ ئافرەتی ڕەشپۆش لەگەڵ من کەوتنەڕێ بەناو کۆلانە ناخۆشە قیرتاو نەکراوەکانا و ملمان نا بۆ ماڵی بووکی دوارۆژ • لەوێ لەپێشدا لەگەڵ دایکی کچەکە قسەمانکرد • من لە دوو دانیشتندا حازربووم• لەبەینی یەکەم و دووەم دانیشتن ماڵی کچەکە خەریکی ئەوە بوون دەربارەی کوڕەکە لە دەم خەڵك و بەهۆی خەڵکەوە ئاگاداری کۆبکەنەوە ، تاکو بزانن چۆن کوڕێکە و خووڕەوشتی باشە یان خراپ و خەریکی چیە • ئەم کردەوەیەی ماڵی کچ شتێکی زۆر رەوایە و لەجێی خۆیەتی •

لە دانیشتنی دووەم ماڵی کچ ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەیان بە ماڵی کوڕەکە گەیاند • لەناو کوردەکان ژنهێنان نە لە ئاسمان دەکرێ (واتا نە شتێکی پیرۆزە) [1] و نەش لە بەینی دوو دڵداری خۆشەویستی سەرزەوی• دڵداری و حەزلێکردن زۆر جار پەیوەندی نیە لەگەڵ ژن هێنان • ئەمە کارێکی خێرە کە لەبەینی هەردوو خێزانی گەنجەکان دەبەسترێ و مەبەستیان ئەوەیە ئەوەندەی پێیاندەکرێ ئەندامێکی تازەی چاك بهێننە ناو خێزانەکەیان • لەبەرئەوە هەردوولا لێکۆڵینەوەیێکی باش دەکەن بۆئەوە کە دڵنیا بن لەوە ئەم ئەندامە تازەیە هیچ کەم و کووڕیێکی نیە •

دایکی کچەکە گوتی بیستوومانە کوڕەکە زۆر جار بۆ چایخانە دەچێ و لەوێ قومار یاری دەکا • بەلام خوشکی کوڕەکە و باوەژن و ئافرەتە دەوڵەمەندەکە هەرسێکیان ئەم قسانەیان بەدرۆخستەوە • لەپاش ئەمە لەبەینی هەردولا لەلایەن کوڕەکەوە گفتوگۆیێکی زۆر کرا و زۆر جار

---

(١) ژنهێنان لەناو موسوڵمانان بە کارێکی زۆر بەرز دادەندرێ .

وەرگێر

سەرگەرم دەبوون و بە دەنگ‌بەرزی قسە دەکرا • لەدواییـــدا خەســووی دوارۆژ دڵنیا کرا کە زاواکەی دوارۆژی هیچ کەم و کوڕی‌یێــکی نیــە • ئەمیش بەڵێنی دا قسەکە بە مێردەکەی بگەیێنێ • ژن‌هێنان یان کچ بەشوودان لەناو موسوڵمانان لەدەست ژنانــە • کە کارە خێرەکە تەواو بوو ئینجـا خەبەر بە پیاو دەدرێ • ئەم جۆرە کردەوەیە هەندێ‌جار لەناو ئێمەش لــە ئەورووپا روودەدا •

لەپاش ئەمە ئێمە باسی مارەییمان کرد ، بەتایبەتی مارەیی پێشەکی کە بۆ خشڵ و رازاندنەوەی بووکەکە تەرخان دەکرێ •

من لە دانیشتنی یەکەم چاوم بە بووکەکە نەکەوت • ئەویــش لــەم دانیشتنە خۆی دەرنەخست • لەپێشدا من وام‌زانی ئەو کچە هەرزەکارە کە هاتوچۆی ژوورەکەی دەکرد بووکەکەیە • بەڵام بە هەڵە چووبووم • ئەو کچە ئامۆزای بوو و لەو ماڵە دەژیا و هەندێ جار لەبابەت داخوازیەکەوە قسەیێکی دەکرد • ئیتر تەنیا باسی مارەیی یەکە دەکرا • بووکی دوارۆژ نــە ئاگای لە زاوا بو و نەش لە توانای بوو بۆ کڕینی خشڵ و بەرگ بۆئەوە کە لەبەری کا و بۆ پێکەوەنانی تفاقی ناوماڵ بۆ ئەو هێلانەیە کە دوارۆژ تێدا دەژیــن •

لەپاشا خەسووی دوارۆژ لەبابەت ئێسك و دەم‌وچاو و قەد و بـاڵای زاواوە پرسیاری کرد • ئەمـــەش شتێــکی ئاســان نەبو و دایــکی کوڕە نەیدەتوانی وا بە باشی وەسفی کوڕەکە بکا هەروەکو لەوێ خۆی دەرخا و پێشاندا • سەیر ئەوەبو وێنەی کوڕەکەیان پێ‌نەبو و ژنان لەم بابەتـــەوە فێری ئەوە نەبوون وێنە پێشان دەن • لە سولەیمانی وێنەگر زۆرن • لەپاش شایی‌یێك کە من حازری بووم بووکەکە بەرگی ئەورووپایی سپی پۆشی و زاوا چاکەت و پانتۆڵی هاوینەی لەبەرکرد و پێکەوە وەکو ئەورووپاییەکان لە لای وێنەگر وێنەی خۆیان گرت •

لەپاشا خەسووی دوارۆژ گوتی ئەو بە قەمەرە بە بەردەم دووکـانی باوکی کوڕەکەدا تێپەڕ دەبێ بەهیوای ئەوە ــ بە بێ‌ئەوە کوڕە فەرقی پـێ بکا ــ چاوی پێ بکەوێ • لەپاشـا بەلێنیدا لەم‌بابەتـەوە قسـە لـەگەل مێردەکەی بکا • ئەمە یەکەم‌جار بوو مێرد هاتە ناو کایەوە • بێتو ئەویش لەم‌بابەتەوە هەمان بیری‌هەبێ ئەودەمە ناوی خوای لێ دێنن و کاری خێرەکە تەواو دەکەن • بەلام داخەکەم من سەفەرم کرد و لە سولەیمانی نەمـام و لە گفتوگۆکانی‌تری حازر نەبووم • بەلام لەپاشـا بیستم بڕیاردرا پشوو بە داخوازیەکە بدرێ و لە کاری ناسکی‌وا پەلە نەکرێ • لەئەنجامدا وا بـڕیاردرا شایی‌یێکی گەورە بکرێ • مالی خەسوو داوا لە دراوسێ‌کەیان بکەن ئیزنیان بدا حەوشە گەورەکەیان بۆ شایی واتا هەلپەرکێ و دهۆل و زوڕنا بەکاربهێنرێ •

## هەلپەڕکێی کوردەواری و هەلپەڕکێی ڕۆژئاوایی

من جارێکی‌تریش گێڕامەوە لێرە پیاوان بەتەنیـا بـە بێ‌ئافرەتـان هەلدەپەڕن • لێرە ئەو ئافرەتانە کە لەگەلیان دەژیام چەند جار بەخۆشیەوە باسی هەلپەرکێی ئەوروپایی‌یان لێ پرسیم • بەلێ هەلپەڕکێی ئەورووپـا لەگەل موسیقای کورد و عەرەب ڕێك ناکەوێ ، بەلام زۆری ئافرەتـەکان لە سینەما چاویان بە هەلپەرکێی ئەوروپایی یان ئەمەریکایی کەوتوە کـە ژن و پیاو بە جووتە دەیکەن • زۆر شتی تازە لێرە لە ئەمەریکاوە نزیـکە نەك ئەورووپا • ئۆتۆمۆبیلەکان ئەمەریکایین و ئەو فیلمانە کە لێرە لە هەردو سینەماکان پێشان‌دەدرێن زۆربەیان ئەمەریکـین • یەکێ لەم سینەمایانـە داپۆشراوە و زستانیە ، لەبەرئەوە لە کاتی پشووی فیلم قرەقڕی خەلـك بەجارێ بەرز دەبێ ، موسیقاش وا بە بەرزی لێ دەدرێ کە هەردوك بەجارێ گوێ کەڕ دەکەن • سینەماکەی‌تری هاوینیە و کراوەیە • ئەمە شتێکی نایابە لە ولاتێ ئاو و هەواکەی گەرم و وشك بێ •

جارێکیان له بەغدا فیلمێکی ئینگلیزیم دی که باسی دلداری بەناوبانگی رۆمیۆ و جوولیێتی دەکرد • ئەمە وابزانم دووره له بیر و خوو و رەوشتی ئافرەتانی کورد [1] •

نەریتی (واتا دەستووری) شووکردن لەپاش دلداری شتێکی زۆر دووره له بیر و باوەڕی ئافرەتانی ئێره • لەمبابەتەوه من زۆر لەمان دوورم• بەلام له لایێکی‌ترەوه ، له رەوشتی‌تری : من خۆم زۆر به نزیکیان دەزانم •

**دیسان نەخوێندەواری**

من واقم وڕدەمێنیَ لەوه که چۆن ژنه نەخوێندەوارەکان بیر له خوێندن ناکەنەوه ، لەگەڵ ئەوەشدا به کتێب و قاقەزی نووسراو دەورەدران [2] •

زۆری ئەو ژنانه من ناسیمن زیرەك و ژیرن ، بەلام بەدەگمەن ئەم ژیریەیان بۆ بیری نووسراو بەکارهێناوه • تەنانەت لەو مالانه که ژنی خوێندەواری لێ‌یه ، ئەم ژنانه فێری ئەوه نەبوون ، شت بخوێننەوه ، واتا بۆ کات‌رابواردن لەباتی دەمەتەقێ کتێب ، گۆڤار یان رۆژنامه بخوێننەوه • پیاوان لێره لەسەر کار ، له دووکان رۆژنامه دەخوێننەوه ، بەلام نایهێننه مالەوه • له مالان لێره کتێب نیه ، هەشبێ چەند کتێبێکی فێرگەن ( واتا مەکتەبن) که لەسەر کەنتۆر دانراون و لەناو تۆزا نوقوم بوون •

---

(1) ئەمه راست نیه . ژنانی کورد باسی دلداری دەزانن و لەم بابەتەوه زۆر چیرۆك دەگێڕنەوه . جاران له دێهات کوڕ و کچ حەزیان له یەك دەکرد و بۆ شووکردن رێك‌دەکەوتن . ئێستا لەبەینی خوێندەواره شارستانیەکانیش ئەمه هەندێ جار روودەدا .

**وەرگێڕ**

(2) ئەمه راست نیه . لەو مالانه که خوێندەوار نیه کتێب و شتی نوسراویش نیه .

**وەرگێڕ**

تەرجومانەکەم کە لە سولەیمانیەوە هاتە تۆپزاوە بۆ لای من تەنیا فەرهەنگێکی (ئینگلیزی ـ عەرەبی)ی پێبوو کە لە کتێبخانەی سولەیمانی خواستبووی ، بۆئەوە کە لە کاتی پێویست وشەکان بدوزێتەوە • بەڵام ئێمە پێویستمان بەم فەرهەنگە نەبوو ، چونکە هەردوکمان هەندێ‌جار باش ، هەندێ‌جار خراپ ئینگلیزیمان قسە دەکرد •

لە یەکەم گەڕانی ناو دێیەکە ـ لەمماڵەوە بۆ ئەو ماڵ ـ تەرجومانەکەم فەرهەنگەکەی بەدەستەوە بوو تاکو لەکاتی پێویست بەکاری‌بێنێ • بەڵام ئەو ئافرەتە لادێییانە کە لە خانوە قوڕینەکانیان دەژیان بە ترسەوە تەماشای ئەو کتێبە بەرگ سوورەیان دەکرد ، لێی مۆڕ دەبوونەوە و دەسڵەمینەوە • وابزانم لەباتی کتێبەکە دەمانچەی بەدەستەوە بووایێ ئەوەندە واقیان وڕ نەدەما و دانەدەچڵەکین •

## بە مێوانی چوون بۆ دووکان

جارێکیان کە لە تۆپزاوە بووم بە قاقەزی بانگ‌کراین (واتا داوەت کراین) • قاقەزەکە بە عەرەبی نووسرابوو • خێزانی ئەندازیارێکی عێراقی لەسەر بەستێنی دووکان خێزانەکەی خانەخوێی منیان بانگ‌دەکرد ( واتا داوەت دەکرد) بۆ خوارەوە بۆئەوە کە لەوێ رۆژێ بەمێوانی رابوێرین •

کە قاقەزەکە گەیشت هیچ پیاوێ لە ماڵ نەبوو • تەرجومانەکەم قاقەزەکەی بۆ ژنەکان خوێندەوە کە بە بیرکردنەوە تەماشایان دەکرد و بڕیاریان دا کە داوەتەکە قەبوول دەکەن بەومەرجە (واتا بەو شەرتە) مێوانەکانیشیان (واتا تەرجومانەکەم و خۆم) بانگ بکرێن • لە وەڵامدا ئەم مەرجە پەسەندکرا • ئێمە دەبوایێ بە قەمەرەی مامیان رۆژی یەکشەمەی هاتوو سەعات دە بگەینە ماڵەکە •

سەعات یازە و نیو دایك و کچ هێشتا بڕیاریان نەدابوو چی لەبەرکەن،

خەریکی جل گۆڕین و خۆپۆشتەکردن بوون • ئێمە تەرجومانەکەم و خۆم بارمان سووك بووە هەریەکە دوو سێ پارچە جلی پێ بو و ماوەی هەلبژاردنمان نەبوو • لەئەنجامدا دایکەکە کە گەنم ڕەنگ بوو کراسێکی ئالی لەبەرکرد لەگەڵ شەروالێکی سورمەی سەوز کە زۆر لێی دەهات• کچەکەشی کە حەڤدە ساڵان بوو شتی سووری لەبەرکرد کە زۆر پێوە جوان بوو • ئەجەی زڕکچی بەسەزمانی بچووك دەبوایێ لەماڵەوە بمێنێ بۆ ئەوە کە مەڕ بلەوەڕێنێ و ئیشی ڤاوماڵی ناخۆشیتری بکا • من زۆر دلگیر بووم ئەم Cinderella[1] بەسەزمانە وا بەکزی و داماوی تەماشای جل گوڕینی ئافرەتەکانیتری بکا • بەڵام دلی زڕ دایك نەرم بوو و ئیزنی دا لەگەلیان بێت • من ئەجەم بردە سەر حەوزەکەی پشتەوە ، سەریم شۆری و پرچم شانە کرد • ئەویش دەم و چاو و دەس و پێی شت (شۆری) • ئینجا وەك بڕووسکە جلە چلکنەکەی داکەند و لە سەنووقە ئاسنینە بچووکەکەی جلێکیتری دەرکرد و لەبەریکرد • جل و بەرگ نابێ بەمچەشنە بخرێتە ناو سەنووقەوە نەك تێك بچن • بەڵام ئەجەی بەسەزمان کە کەتێوری نەبوو خۆ سەنووقێکی هەبوو جلەکانی لە مۆرانە بپارێزێ • لێرە جلی ڤاو سەنووق ئاردی تووتنی پیا دەکرێ بۆ ئەوە کە مۆرانە لێی نەدا •

ژنەکان و پیاوەکان بە بەرگی خوریسووکەوە و شەرواڵی پانەوە لە ژووری مێوان لەسەر قەنەپە و کورسی دانیشتن • ئەم جۆرە دانیشتنە بۆ پیاوەکان ڕێكدەکەوت ، بەڵام لەگەڵ جل و بەرگی ژنان ڕێكناکەوێ •

---

(۱) Cinderella ناوی کچێکی بچووکە لە چیرۆکەکانی ئەورووپا باسی دەکرێ . گوایا سندێرێللە زڕکچ بوە و باوەژنەکەی خراپ لەگەلیا جوولاوەتەوە . لەپاشا دایکی پەریەکان ، کە گوایا خوا بوە ، هاتوەتە فریای ، لەدەس باوەژنەکەی رزگاری کردوە و گەیاندویەتە خۆشی و کامەرانی .

وەرگێر

خەسووی ماڵەکە بە جل و بەرگی رەش ، سەرپۆشێکی ڕەش و ڕۆبێکی رەشەوە هاتە ژوورەوە • ئەویش لەگەڵ ئەم ژوورە ئەورووپاییە ڕێك نەدەکەوت • تەنیا ئافرەتی ماڵ کە ژنی ئەندازیارەکە بوو لەگەڵ کچەکەی کە جل و بەرگی ئەورووپایی هاوینەیان لەبەربوو لەگەڵ ژوورەکە ڕێك دەکەوتن • من بۆ گەیاندنی پەیامێك بە دەم چووم بۆ مێوانخانەی ئینگلیزی British Reshouse • ژوورەوەی ئەم خانوە ــ لەبەر پانکەی بن‌میچ و مەکینەیێکی زەلامی هەوا سارد کەر ــ فێنك بوو • بەڵام هەوای دەرەوە زۆر گەرم بوو • من ئەو سەد یاردەیە بە قەمەرە چووم ، چونکە لەبەر گەرما نەمدەتوانی لەدەرەوە بە پێ بڕۆم • ئەم هاتوچۆیەم هەر نیو سەعاتی خایاند • کە هاتمەوە دانیشتنی مێوانەکان گۆڕرابوو • تەنیا خاوەن ماڵ و پیاوەکان لە ژووری مێوانی کورسی و قەنەپەدار دانیشتبوون • ژنان چووبوونە ژووری نووستن ، لەوێ لەسەر دۆشەك بە رەحەتی پاڵیان لێ‌دابووەوە و خەریکی دەمەتەقێ ، پێکەنین و جغارە کێشان بوون • بەم‌چەشنە دنیای پیاوان لە هی ژنان جیابووەوە و وادیاربوو هەردولا لەم بارە تازەیە زۆر دڵخۆش بوون •

لەدواییدا دەمی نانخواردن هات ، سفرەیێکی پلاستیك لەسەر زەوی راخرا کە چێشتی پلاو ، مریشکی کوڵاو ، مریشکی سوورەوەکراو ، چێشتی سەوزە و شتی‌تری لەسەر دانرا • خواردنەوە بریتی بوو لە ماستاوی سارد • چەقۆ و چەتاڵ و قاپی بەتاڵیش لەوێ دانرابوون ، بەڵام زۆری ژنەکان بەدەس نانیان دەخوارد • لەپاشا ژووری نانخواردنیان پیشاندایین کە پیاوەکان نانیان لێ خواردبوو • لەوێ چاومان بە مێوە و شیرینی کەوت • لەدوای نانخواردن لەژووری حەمام ژنان دەستی خۆیان شۆری • لەوێ خەسووی ماڵەکە دەسنوێژیشی هەڵگرت • لەژووری حەمام هەم بانیۆ هەبوو ، هەمیش دەسشۆری ئەورووپایی • بەڵام بۆ هەندێ ژنی

لادێیی بەکارهێنانی دەسشۆرەکە ناخۆش بوو • یەکێکیان نەیزانی چۆن بەلووعەی ئاوەکە بکاتەوە و بیگرێتەوە و داوای یارمەتی کرد • ئەوان فێری حەوزی ئاو بوون کە بە بێ‌بەلووعە راستەوخۆ دەست و پێ‌یانی لێ بشۆن •

ئێمە گەڕاینەوە ژووری نووستن بۆ خەوی پاش نیوەڕۆ • خاوەن‌ماڵ دەستێ جلی ئاورێشمی ئەورووپایی بۆ نووستن بۆ هێنام • ئەمە شتێکی زۆر سەیر و سەمەرە بوو • لێرە خەڵك شەوان بە بێ‌جل‌گۆڕین دەنوون ، مـن جلێکی نووستنم پێ‌درا کە پاش نیوەڕۆ پێ‌ی بخەوم !! ئەمە تەنیا ماوەیێکە لای ئێمە لە ئەورووپا کە بە بێ‌جل‌گۆڕین واتا بە بەرگی رۆژەوە دەنوین •

خەسوو ئازا هەڵسا بەرماڵەکەی راخست و نوێژەکەی کرد • لەپاشا بەرماڵەکەی دایە ژنەکانی‌تری بۆ نوێژ کردن • ئێمە هەموو بە بێ‌دەنـگی لەسەر دۆشەکەکان دانیشتبووین و لەپاش راگرتنی مەکینەی هەوا فێنك‌کەر ئیتر ژوورەکە کپ بوو •

من بە دەنگی چای‌پەز و ئیستیکان خەبەرم بوەوە و هەڵسام سەماوەر دانرابوو و ئیستیکان و ژێرپیالە و کەوچکی بچووك لە سەنووقی تایبەتی خۆی دەرهێنرابوون و لەسەر دەسـتووری کوردەواری دەس‌کرابوو بـە ئامادەکردنی چای ئێوارە • بەڵام چای تێ‌کردن لە ژوورێ کە زەویەکەی بە تەختە دار داپۆشرابێ جوان نەبوو ، چونکە ئیستیکانـەکان تەختەکانیـان لەکەدار دەکرد • دەبوایێ ئەم شتانەیان لەسەر سفرەیێك دابنایێ • بـەڵێ لادێ‌یەکان زۆر جار لەسـەر زەوی ئیستیکانـەکان دادەنـێن ، بـەڵام زەویەکانیان بە چیمەنتۆ ، بە قوڕی لووس‌کراو یان بە بەرد داپۆشراون • لەو دێیانە ژووری بە تەختە داپۆشراو نیە •

لەم خانوە ژووری تایبەتیش هەبوو بۆ چێشت‌لێ‌نان • لەوێ سەنووقی ساردکەر ، مەکینەی ئەلەتریکی چێشت لێنان و حەوزی ئاسنی قاپ‌شۆرین

هەبوو • ئەم حەوزە ئاسنینە بۆ قاپشۆرین بەکار نەدەهێنرا • لەباتی ئەوە قاپ و مەنجەڵ لەسەر زەوی ــ لەسەر رەوشتی جاران ــ بەهۆی دۆلکە و تەشت دەشۆرا • لەم خانوە ئەوروپاییە شەوان خەڵک لە سەربان نەدەنووستن ، ئەمەش لەگەڵ هەوای گەرمی وڵاتەکە نەدەگونجا • بەڵام ئەو ئەوروپاییانە کە لەسەر بەستێنی دووکان دەژیان لە ژوورەوە دەنووستن •

ئێوارە هەموو پێکەوە چووین بۆ دیتنی بەستێنی دووکان • لەوێ یەکەمجار و دواجار بە پێ بەسەر پردە تەسکە هەڵواسراوەکەدا تێپەڕیم کە لەپێش تەواوبوونی بەستێنەکە بۆهاتوچۆ دامەزرابوو و لەپاشان لابرا • بە ئۆتۆمۆبیل تێپەڕبوون بەسەر ئەو پردە تەسکەدا ترسناك بووە لێخوڕ دەبوایێ لەسەرخۆ ئۆتۆمۆبیلەکەی لێخوڕی و باش ئاگای لە خۆی بێ ، نەك لە قەراغەکەی بخلیسکێ و بکەوێتە خوارەوە ناو شیوی ئاوەکە • بۆ منیان گێڕایەوە جارێ قەمەرەیێك خلیسکا و لە قەراغی پردەکە گیربوو و توانیان رێبوارەکان لە قەمەرەکە دەرهێنن و لە کەوتنەخوارەوە ڕزگاریان بکەن •

لەسەر ئەم پردەوە بە ئۆتۆمۆبیل تێپەڕین ئاسان بوو ، چونکە تۆ چاوت لە شیو و ئاوەکەی خوارەوە نەبوو • بەڵام بە پێ تێپەڕبوون ناخۆش بوو ، چونکە تۆ هەستی ئەوەت دەکرد لەبەینی عاسمان و ئاوەکەی خوارەوەی • من بۆئەوە کە سەرم سوورنەخوا دەسم گرت بە باڵی ئافرەتێ کە لە تەنیشتم بوو • ئەجەی هاوڕێی بچووکم بەتەنیا بەسەر پردەکەیا لەپێشا ئازایانە تێپەڕی • لەناوەڕاستدا پێڵاوەکانی داکەند تاکو بە پێی پەتی بەئاسانتر بەسەر تەختەکانا بڕوا • لەپاشا سەری گێژ بوو و دانیشت و بە دەس و پێ دەستیکردە گاگۆلکێ • ئیتر ئێمە گەیشتینە سەری و هەڵمان گرت و گەیاندمانە ئەوبەر •

من ببرای ببرای ناتوانم بۆ هاورێکانم لەم وڵاتە دوورە قاقەز بنووسم•
بەڵام ئەوان دەتوانن قاقەزم بۆ بنووسن : دەچنە لای قاقەزنووسەکانی
بەردەم سەرا ؛ لەوێ چیان ویست بۆیان دەنووسن • یەکێ لەو
قاقەزنووسانە تەنانەت بە مەکینە شت دەنووسێ و دەتوانێ قاقەزی رێك و
جوان بە مەکینەی دەس بنووسێ •



## - ١٢ -

# ژنـانی موسولمان

**پەچەو عەبـــا**

ئەمە گرنگترین بەشی ئەم کتێبەیە کە باسی پایەی ژنانی موسولمـان دەکا بەپێی دەستووری ئیسلام ، ئەو نیزامە کە لە ئەورووپا لەناو ئێمـە نیزامی (حەرەم)ی پێ دەبێژرێ • من چەند جارێ لەمەوپێش نەختێ باسی ژیانی ئافرەتانی ئەم ناوەم کرد ، بەڵام ئێستا وا بە بـاش دەزانـم نـەختێ باسی پایەی ژن بکەم لەناو کۆمەڵانی موسولمان •

کە یەکێ لە گەرووی بۆسفۆرەوە تێپەڕ بوو ، تەنیا لە ئەورووپـاوە ناچێتە ئاسیا ، بەڵکو لە دنیای مەسیحیەوە دەچێتە دنیـای ئیسـلام [(١)] • ئیسلام لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمین دەگەیشتە بەلقان • ئێستـاش لـە

(١) ئەمە تەواو نیە . لە تراکیای یۆنانستان ، لە بولغارستان و لە هەرێمی بۆسنە و قەرەداغ لە یۆغۆسلاڤیاش موسولمان دەژین ، ئەمە بێجگە لە بەشی ئەورووپای تورکیە کە زۆربەیان موسولمانن .

وەرگێڕ

هەرێمەکانی بۆسنەو قەرەداغی یۆگۆسلاڤیاو لە ئیستانبوول لە رۆژئاوای گەرووی بۆسفۆڕ لە ئەورووپا کۆمەڵانی موسولمان دەژین •

لە وڵات و هەرێمەکانی ئیسلام جیاوازی سەرەکی لەبەینی هەژار و دەولەمەند نیە ، بەڵکو لەبەینی ژنان و پیاوانە • کۆمەڵ دەبێتە دوو بەشەوە : ژنان و پیاوان • پیاوان لە دەرەوەی ماڵ دەژین ، ژنان لەناو ماڵان لە حەوشە دەژین [١] • لەوحەوشانەوە ژنان دەتوانن لە پەنجەرە داپۆشراوەکانەوە دەرەوە ببینن ، بەڵام خەڵك لە دەرەوە ناتوانن ناوماڵ ببینن [٢] •

ئەم دابەش کردنەی کۆمەڵ بە چینی پیاوان و چینی ژنان گوایا لە دینی ئیسلامەوە هاتوە • ئەمەش راست نیە • چونکە لە زەمانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێ — وەرگێڕ ) ژنانی عەرەب سەربەست بوو و خێزانی پێغەمبەر (خەدیجە) بە سەربەستی بازرگانی دەکرد و حەزرەتی موحەممەد هاتوچۆی شامی بۆ کرد و لەپاشان خواستی •

**پەچە و عەبا چۆن داهات**

لەپاشا کە حوکمی ئیسلام بڵاوبوەوە و گەیشتە سووریە ، کە ژیار ( واتا حضارة Culture )ی هێلینی تێدا پەرەی سەندبوو ، لەو ژیارە کە ژنان لە پیاوان جیاکرابوونەوە، موسولمانەکان ئەم دەستوورەیان

---

(١) ئەم جیاوازیەی دنیای ژنان لە دنیای پیاوان ئێستا لە عێراق کەمبوەتەوە. زۆر ژن ئێستا لە دەرەوەی ماڵ دەژین و دەتوانن بە سەربەستی ئیش بکەن و بۆ شتکرین بۆ بازار بچن .

وەرگێڕ

(٢) لە وڵاتی موسولمانان نابێ پیاوان لە پەنجەرەکان نزیك بنەوە و تەماشای ناوماڵی خەڵك بکەن . ئەمە نەك تەنیا لەناو موسولمانان ، بەڵکو لە هەموو دنیای پێشکەوتوو ناشیرینە .

وەرگێڕ

لێ وەرگرتن [١] • ژیاری هێلێنی بەشێکە لە هی یۆنان کە لە ڕۆژهەڵات بڵاوبووبوەوە • لە یۆنانستانی کۆن تەنانەت لە سەردەمی سۆقرات ژنان ژیانێکی جیاوازیان هەبوو لە هی پیاوان و دەبوایێ ژنان لە مالەوە بژین •

لە قورئانی پیرۆز خوا ئەمر دەکا کە دەبێ ژنە موسوڵمانەکان باش خۆیان داپۆشن و دەبێ خشڵی خۆیان تەنیا پیشان مێرد و کەس‌وکاری مەحرەمی خۆیان بدەن [٢] • زۆر جار خەلك ئەم ئایەتە بە بەڵگە دادەنێن کە ژن دەبێ بە پەچە و عەبا خۆی داپۆشێ • بەم‌جۆرە دەستووری پۆشینی ژنانی ئیسلام پەیدابوو • تورکە دەوڵەمەندەکان جاران خانوەکانیان دەکرد بە دوو بەشەوە : بەشی پیاوان کە ناویان نا (سەلاملك) واتا بەشی سەلام‌کردن لە پیاوان و بەشی ژنان کە ناویان نا (حەرەملك) واتا جێگای ژنان کە نابێ پیاوی نامەحرەم بچێتە ناوی • ئەم وشەی حەرەملکە گەیشتە ئەورووپا و بوە Hareu حەرەم [ واتا جێگای تایبەتی ژنان لەناو موسولمانان ــ وەرگێڕ ] • عەبا و پەچە لە شاران لەبەردەکرێن ، بەلام لە گوندەکان و لەناو کۆچەرەکان عەبا و پەچە نیە ، لەوێ ژنان دەبێ بەرەڵلا

---

(١) هەندێ مێژووناس دەڵێن دەستووری جیاکردنەوەی ژنان لە زەمانی عەباسیەکان لە سەدەی هەشتەم و نۆیەم پەیدابو . یەکێ دەڵێ ئەم دەستوورەیان لە ئیران لە عەجەمەکان وەرگرت ، یەکێ‌تریش دەڵێ موسولمانەکان بۆ جیاکردنەوەی ژنی سەربەست لە کەنیزەکەکان پەچە و عەبایان لە عەجەمەکان وەرگرت. ئەودەمە ژنانی کەنیزەك ئەوەندە زۆر بوون ، ژنە سەربەستەکان دەربەست بوون خۆیان داپۆشن تاکو لەوان جیابکرێنەوە .

**وەرگێڕ**

(٢) ئەمە دەقی ئایەتەکەیە لە سورەتی نوور ئایەتی ٣١ : « وقل للمؤمنات يغضضن من ابصارهن و يحفظن فروجهن ولايبدين زينتهن الا ما ظهر منها و ليضربن بخمرهن على جيوبهن ولا يبدين زينتهن الا لبعولتهن او آبائهن او ابناء بعولتهن ... الاية » .

**وەرگێڕ**

بن و بە سەربەستی ئیش بکەن • ژن ناتوانێ بە عەبا و پەچەوە مەڕ بدۆشێ یان پووش و چیلکە بۆ سووتەمەنی کۆکاتەوە • بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چینی ژنان لە هی پیاوان جیاکراوەتەوە • ژنان پێکەوە و پیاوان پێکەوە دەژین [1] •

**لابردنی پەچە و عەبا لە تورکیە و یوگوسلاڤیا و ئێران**

لە سەدەی بیستەم پەچە و عەبا وردە وردە لاچوو • لە میسر لابراوە • مستەفا کەمال لە تورکیە ساڵی ١٩٢٥ پەچەی قەدەغە کرد و هاواری کردە ژنان : « هەی ژنان ! دەم و چاوی خۆتان پیشاندەن و تەماشای دنیا بکەن » • ساڵی ١٩٥١ حوکوومەتی یوگوسلاڤیا پەچەی بە توندی قەدەغە کرد و ژنانی پەچەدار گیران و خرانە بەندیخانەوە • بەڵام بۆ بگیرێن ؟ ژنان دەبێ دڵخۆش بن بەوە کە بێپەچە دەتوانن بە سەربەستی بگەڕێن ، ئیش بکەن ، بخوێنن ، خۆیان پێبگەیێنن و پێشکەون •

ساڵی ١٩٣٦ کە پەچە لە تاران لە ئێران قەدەغەکرا ژنان بەمە زۆر دڵگیر و عاجز بوون • ئەم دەستوورە تازەیە بە سێ هەفتە بە سێ پایە جێبەجێ کرا • لە هەفتەی یەکەم لە کۆڵانەکانی دەوروپشتی شار نەدەبوایێ ژنی پەچەدار بێتە دەرەوە • لە هەفتەی دووەم قەدەغە کردن گەیشتە شەقامە گەورەکان ، لە هەفتەی سێیەم ژنی پەچەدار نەیدەتوانی بچێتە ناو بازاڕەکانی ناوەڕاستی شار • ژنێکی دینمارکی کە لەودەمە لە تاران دەژیا دەگێڕێتەوە کە کچە کارەکەرەکانی لە هەفتەی یەکەم نەیانویست بێپەچە لە کۆڵان و شەقامەکان خۆیان دەرخەن و بچنەوە ماڵی باوکیان کە لە دەوروپشتی شار

---

(١) بەڵام لە لادێ ماوەی تێکەڵبوونی پیاو و ژن زیاترە • ژن دەتوانێ لەناو کوردەکان میوانی پیاو قەبووڵ کا .

**وەرگێڕ**

بوو . لەبەرئەوە داوای تەکسیریان کرد تاکو بیانگەیێنێتە ماڵ . بوچی ئەم ژنانە پێیان خۆش نەبوو کە لە پەچە دادانەوە رزگار و سەربەست کران !!

**ماف و گیانی لێپرسینی ئافرەتان**

کە لەناو ژنە موسوڵمانەکانی کوردستان ژیام تێگەیشتم کێشـەی (واتا موشکیلەی ، مەسئەلەی) سەربەستی ژن لەتەنیا پەچە لابردن قووڵترە. نابێ ئێمە ئەمە بەراورد بکەین لەگەڵ مافی ئافرەتانی ئەورووپـا لە پەنجا ساڵی رابوردوو بۆ چوونە زانکۆ (جامیعە) تاکو پێکەوە لەگەڵ کورەکان بخوێنن ، مافی دەنگدان لە هەڵبژاردن (ئینتیخابات) و یەکسانی سیـاسی کە هەوڵیان بۆ دا و پێی گەیشتن [1] .

لەکاتی ژیانم لە عێراق نەمتوانی لەگەڵ کۆمەڵـەی ژنـانی عەرەبی خوێندەواری بەرز لە بەغدا پەیوەندی پەیدا کەم تاکو بزانم کێشەی مـاف

---

(١) لە ئەورووپا و ئەمەریکا هێشتا ژنان داوای زۆر مافی‌تری دەکەن ، لەگەڵ ئەوەشدا زۆریان ئەو مافانە ــ وەك مافی دەنگدان ــ بەکارناهێنن کـە پێیاندراوە . زۆری ژنانی رۆژئاوا یان ناچن بۆ دەنـگدان یـان وەك مێردەکەیان یان باوك و برایان دەنگدەدەن . ژنانی رۆژهەڵات وا وردە وردە دەگەنە زۆری مافەکانی پیاو . مافیش نابێ بـە یەکجـار کوتوپڕ بدرێ . چونکە لەگەڵ مافا گیانی لێپرسین (واتا رۆحی مەسئوولیەت) هەیە . هەتا ژن خوێندەوار نەبێ و گیانی لێپرسینەوەی نەبێ لەو مافە کە پێیدەدرێ کەڵك وەرناگرێ . لە ئەورووپا بۆ وێنە ژنی ئیشـکەر لەکاتی منداڵ بەخێوکردن هەتا ٦ ــ ٧ ساڵان واز لە ئیشەکەی دێنـێ بۆئەوە کە بە باشی رۆڵەکەی بەخێو کا و پێیبگەیێنێ . لای زۆربـەی ژنانی رۆژهەڵات مووچەخۆری (واتا وەزیفە) لە منداڵ بەخێوکردن زۆر گرنکترە چونکە شتێکی تازەیـە . ژنـان منداڵەکەیـان لای کارەکـەر بەجێدەهێڵن ، یان لەم ژنەوە دەیدەن بە ژنێکی‌تری . بەمجۆرە منداڵەکە تووشی نەخۆشی نەفسی و عەصەبی دەبـێ . کە گەورە بوو رقـن ، توورە ، شەڕانی یان ترسنۆك دەبێ . لە دڵا رقی لە دایـکی دەبـێ ، لەبەرئەوە رقی لە هەمووکەس دەبێ .

**وەرگـێڕ**

وەرگرتنیان چۆنە و چۆن دەیانەوێ خۆیان پێشخەن • ئەو ژنانە کە ناسیمن کورد بوون ، زۆربەیان کوردی لادێیی بوون کە لە دیهاتی ناوشاخەکانی باکووری عێراق دەژین • ئـەم گوندانـە دوورن ، زۆر جـار رێـگای ئۆتۆمۆبیلیان بو ناچێ و تۆ دەبێ بە پشتی ولاغ بە رێگای تووش و ناخۆشا بۆ ئەو گوندانە بچی • زستان کە بەفر باری هەندێ لەو گوندانە چەنـد رۆژێ ، بەڵکو چەند هەفتەیێ لە دنیا دادەبڕێن و بە تەنیا دەمێنن •

**ئـافرەتان و شت خوێندنەوە :**

بەڵێ لە کوردستان ، بەتایبەتی لەناو شاخە بەرزەکان رێـگای بـاش هێشتا کەمە • بەڵام کوردستان پێویستی بە جۆرە رێگایێکی‌تری هەیـە : رێگای پێشکەوتن و پەرەسەندنی بیری نوێ ، زانیاری و خوێنـدەواری لەناو شار و گوندەکان • ئەمیش بەهۆی پەرەسـەندنی خوێنـدەواری و بڵاوکردنی شتی نووسراو دەبێ • لە دەرەوەی شاری سولەیمانی ئەو ژنانە کە تووشیان بووم کەسیان خوێندەوار نەبوون و زۆری ژنانی سولەیمانیش نەخوێندەوارن [1] • ئەو ژنە خوێندەوارانەش کە هەن و کە جاران چوونەتە فێرگە ئێستا بەدەگمەن شت دەخوێننەوە • بەڵێ قاقەز دەخوێننەوە ، بەڵام فێری ئەوە نەبوون ، لەباتی دەمەتەقێ ، تۆی گوڵە بەرۆژە قرتاندن و باسی ئەم و ئەو بە خراپە کردن ، شتی نووسراو واتا کتێب ، گۆڤار یان رۆژنامە بخوێننەوە •

لە دێهات رۆژنامە نیە • لە شاری سولەیمانیش هەبێ ژنان نایخوێننەوە•

---

(۱) لە دە ساڵی رابوردوو خوێندەواری زۆر بڵاوبووەوە لە ناو و دەرەوەی شارەکان . ژنانی نەخوێندەوار کە تەمەنیان لە بیست ساڵ کەمتر بێ لەناو شارەکان زۆر کەمن و بەهۆی کردنەوەی فێرگە (واتا مەکتەب) لـە ناوایە گەورەکان کچە لادێیەکانیش وردە وردە فێری خوێندەواری دەبن .

وەرگـێر

پیاوان له چایخانه و دووکان دەیخوێننەوە ، بەڵام بەدەگمەن بۆ ماڵـەوە دەیهێنن ، ئەو ژنانە کە خوێندەوارن لە ماڵەوە لە باوک ، مێرد یان کوڕیان داوای رۆژنامە ناکەن • ژنان کە دەچنە بازاڕ بۆ بامیـە و تەماتـە کڕین ، رۆژنامەیێکیش ناکڕن لەگەڵ خۆیان بیهێننە ماڵەوە • بەڵێ رادیۆ دەنگ‌وباس بڵاو دەکاتەوە ، بەڵام ژنە نەخوێندەوارەکان گوێی لێ ناگرن • چونـکە تێی‌ناگەن و ئاگایان لە دەنگ و باسی دنیا و بناغەکەیان نیە • ئەمانە تەنیـا گوێ لە دەرسە دینیەکان دەگرن و حەزی لێ دەکەن •

**چۆن ئافرەتە نەخوێندەوارەکان بەزەیی‌یان پێم دەهات ؟**

سەیرتر شت بۆ من ئەوەبوو من بیرای بیرای تووشی ژنێکی کورد نەبووم حەسوودیم پێ بیا بەوە کە بە سەربەستی دەگەڕێم و بەرگی سووك و سادەم لەبەرە • بەپێچەوانەی ئەوە وا تێ‌دەگەیشتن من بە جـلە ئەورووپـایی‌یە هاوینیە سادەکەمەوە پۆشتە نیم و وەك هەژار خۆم پۆشیوە و بەزەیی‌یـان پێم دەهات • کە دەیاندی من بەتەنیا هاتووم و دەگەڕێم دڵیان پێم دەسووتا و لە دڵی خۆیانا دەیانگوت : «دە تەماشای ئەم ئافرەتە بەسەزمانە کە چەنـد بێ‌کەسە ، کەس رێزی لێ نەگرتوە لەگەڵیا بگەڕێ و کە تووشی شـتێ بوو لەسەری بکاتەوە و بیپارێزێ • خۆ دنیا بێ گورگ و چەقەڵ نیە !! » لـە یەکەم هەفتەی دانیشتنم لە دێی تۆپزاوەی لای دووکان ژنـانی خـانە خوێکەم پێ‌یان‌گوتم : « بێتو بتەوێ جلێکی کوردانەی باشت بۆ دەکەین وەك هی خۆمان کە لەبەری‌کەی و پێیوە بگەڕێی • ئـەو بەرگە کە لـە ئاوریشم و سورمە دروست‌دەکرێ و ڕەنگا و رەنـگە و دەبریقێتـەوە و ئەوەندە درێژە دەگاتە سەرزەوی » • لە دڵی خۆیانا دەیانگوت : عەیب و شوورەیی نیە ئەم ئافرەتە باشە وا بە قول و لاق رووتی دەگەڕێ • لەپاشا پێ‌یان‌گوتم : بێتو بمەوێ دوو ـ سێ کەس دەخەنـە تەکم کە لەگەڵما بگەڕێن بۆئەوە کە شانازی پێیوە بکەم و خەڵك بە ئافرەتێکی گرانم دابێن•

بەلام من ئەمەم قەبووڵ نەکرد ، چونکە پێویستم پێ نەبو • من بەتەنیاش بگەڕایەم خەڵك هەر ریزیان لێ دەگرتم و دڵنیا بووم کە تووشی شتێ بووم لەسەرم دەکەنەوە ، چونکە میوانی شێخی تۆپزاوە بووم • لەپاشا ژنێ لە هیچ لایێکی دنیا ناتوانێ بە سەلامەتتر لە وڵاتانی ئیسلام بگەڕێ • تووشی هەرکەسێ بێ دەزانێ ئەم ئافرەتە خێزانی هەیە ، کەسوکاری هەیە کە ئامادەن هەموو دەمێ لەسەری بکەنەوە •

کە ژنانی تۆپزاوەی خانەخوێم دەچوون بۆسولەیمانی باشترین بەرگیان لەبەردەکرد و پەچە و عەبایان دەپۆشی و دەیانزانی کام جۆرە بەرگ لە شاری سولەیمانی نایابە • تەرجومانەکەم جاتتایێکی بچووکی پێ بوو بۆ هەموو گوندێکی دوور کە بە پشتی وڵاغ دەچووین لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆئەوە کە عەباکەی تیا بپارێزێ و گەیشتەجێ زوو لەبەری‌کا • کە لە بەغدا پێکەوە بووین چەند جارێ پێم‌گوت : ئێمە لە بەغدا غەریبین و نەناسراوین لەبەرئەوە وا باشترە وەك من بێ‌عەبا بگەڕێی • پێتو بلووز و تەنوورە لەبەرکەی خەڵك بە بیانی (واتا بێگانە)ت دەزانن • بەلام ئەمەی قەبووڵ نەکرد و دەیگوت : ئۆی ! بە پرچ و مل رووتی لە بازاڕ و شەقامەکانا بگەڕێم ؟؟ ناکرێ و نابێ !

**ژنان دەچنە سینەما**

ئێوارەیێ لە سولەیمانی لەگەڵ چەند ژنێك ویستمان بچینە سینەما • سینەماکە هاوینی و کراوە و لەژێر عاسمان بوو ، واتا بانی بەسەرەوە نەبوو • فیلمێکی فارسی تێدا پێشان دەدرا کە چیروکێکی هەزار و یەك شەوی دەگێڕایەوە • لەبەرئەوە ژنان و پیاوان بۆ دیتنی دەچوون • بەلام ئێمە ــ داخەکەم ــ بە بێ‌دیتنی فیلمەکە گەڕاینەوە • دەزانن بۆ ؟ چونکە لۆجی بەتاڵمان نەدۆزیەوە بۆئەوە کە بە جیاوازی تێدا دانیشین • ژنەکان هەموو خۆیان داپۆشیبوو و کەس نەیدەناسین ، بۆ منیش قەیدی نەدەکرد لەناو

پیاوان یان ژنان دانیشم • من هیچم پێ نەکرا و هیچم پێ نەگوترا • ژنەکان هەموو سەرزەنشت و لۆمەی برا گەورەکەیان کرد کە بۆچی لەوە پێشتر زوو لۆجێکی نەگرتبوو • لەبەرئەوە ئێمە هەموومان وەك مێگەلە مەڕ کەوتینەڕێ و لە سینەماکە لۆش لۆش دەرچووین • برا کلولەکەشیان لە پشتمانەوە زۆر بە عاجزی و مەلوولی دەڕۆیی و وا دیار بوو هەستی بە هەلەکەی ( واتا خەتاکەی ) خۆی کردبوو و دەیزانی لۆمەکەیان لە جێی خۆیەتی •

من وا ڕێك کەوت جارێکی‌تری بتوانم بۆ هەمان فیلم بچم • پاش چەند ڕۆژێ ئافرەتێکی ناسراوی شارەکە تەرجومانەکە و منی بانگ کرد بۆ سینەما • ئەمجارە توانیمان لۆجی بەتاڵ بدۆزینەوە و لە لۆج دانیشتین • ژنەکان پەچە و عەبایان پۆشیبوو • کە فیلم دەسی پێ دەکرد پەچەکەیان لادەدا ، کە ڕادەوەستا و چراکان دادەگیرسان خێرا پەچەکەیان دادەدایەوە ، نەدەبوو بێرینە تەماشاکەرەکان کە سینەماکەیان پڕکردبوو ، قرمقڕیان دەکرد و دەنگیان دەهات چاویان بە پەنجەرەیێکیان بکەوێ •

**پایەی ژنە موسولمانەکان لە هی پیاوان نزمتر نیە**

هەندێ کەس وا تێ‌دەگەن پەچە و عەبا ئەوە پێشان‌دەدا کە پایەی ژنی موسولمان لە هی پیاوان نزمترە • من کە یەکەم ژنی پەچەدارم لە شاری Mostar, Sarajevo لە یۆگۆسلاڤیا سالی ۱۹۳۹ چاوپێ‌کەوت ، بە هەموو گیانمەوە بەزەییم پیا هات و دلم پێ سووتا • بەلام کە لە لۆجەکەی سینەما لەگەل ژنە پەچە و عەبادارەکان دانیشتبووم بیرای بیرای هەستی ئەوەم نەدەکرد ئێمە لە پیاوان خوارترین ، بەلکو هەستی ئەوەم دەکرد کە ئێمە چینێکی بەرز و هەلبژاردەین • لەبەرئەوە نابێ خۆمان پیشانی خەلك بدەین • ئەمە ژوورە بچووکەکانی هەندێ کلێسەم دەخاتەوە بیر لە هەندێ گوندەکانی ئەوروپا کە پەنجەرەکانی داپۆشراون و دیوارە دارینەکەی

کون کونە • خێزانی کۆنتەکان (واتا بەگزادە بەرزەکان) لەو چەشنە ژوورە بچووکانە ــ کە لە لۆجی سینەما دەچن ــ دادەنیشن بۆئەوە کە خۆیان پیشاندەن کە لە چینی خەڵك و بۆرە پیاو جیاواز و بەرزترن • من هەندێجار دەمویست ئافرەتە کوردەکان تێبگەیێنم حازربوونی ژن لەسەر مێزی نانخواردن لەگەڵ پیاوان جوانی و خۆشی و ڕەونەق دەخاتە ناو ئەو کۆمەڵە و زۆر بوونی ئافرەتی جوان و رازاوە لە ئاهەنگی شانۆگەری (واتا تەمسیل) ئاهەنگەکە جوانتر ، خۆشتر و بەرەنگتر دەکا ، بەڵام ئافرەتەکان ئەم قسانە نەدەچوە مێشکیانەوە •

من هەندێجار تووشی گەنجێکی کورد دەبووم کە لە ئەورووپا یان ئەمەریکا خوێندوویە ، پێیدەگوتم دەیەوێ تەنیا یەك ژن بێنێ و خۆی کچێك بۆ خۆی بدۆزێتەوە نەك بەهۆی کەس و کاری و دەبێ پێش مارەبڕین چاوی بە بووکەکەی بکەوێ • ئەوەی سەیر و سەمەرە بێ ئەوەیە بووك بەهۆی پەچەکەیەوە دەتوانێ ــ بەدزیەوە ــ زاوا ببینێ • گەنجێکی کورد کە نەچووبوە ئەورووپا جارێ لە من شتی سەیری پرسی و گوتی : راستە لە ئەورووپا کە کوڕێك لەسەر شەقام تووشی کچێك بوو دەتوانێ داوای لێ بکا شووی پێ بکا ؟ ئەمانە هەندێ بیری خراپ و چەوتیان هەبوو لەلایەن سەربەستی ژنانی ئەورووپا و وایاندەزانی بێتو سەربەستی بە ژنانی کورد بدرێ ، ئەوانیش لە دوارۆژدا وەك ئەورووپاییەکان لە رێ دەردەچن •

کە گەنجەکانی ئێرە چاویان بە هەندێ وێنەی ژنی نیمچە رووت یان چیرۆکی ژنی خراپ لە سینەما دەکەوێ ، وادەزانن ئەمە ژیانی ئاسایی راستەقینەی ژنانی ئەورووپا پیشاندەدا • ئەمە لە لایێکەوە راست نیە و لە لایێکیترەوە خەتای لای خراپی ژیانی کومەڵی ئێمەیە لە ئەورووپا ، لەو ئەورووپایە کە هەندێ ژن ئەو سەربەستیە کە پێیاندراوە بۆ خراپە بەکاری دێنن •

من له تۆپزاوەی لای دووکان کچی خانەخوێکەم زۆر خوش دەویست • جارێـــك بەگالتەوە پێیان‌گوتم : خـــانم بۆچی لەگەڵ خـــۆت نـــايەی بۆ دێنمارك بۆ کوڕەکەت • خۆ هەردوکیان تەمەنیان له یەك نزیکه • ئەم گالتەیه دوو شتی جیاواز پیشان‌دەدا بۆ ئەوان و بۆ من • بۆ ئەوان ئـــەوه پیشان‌دەدا دەیانەوێ لەگەڵ خێزانی من ــ که لەوانەوه دووره و نايناسن ــ پەیوەندی پەیداکەن • بۆ منیش مەبەستیان ئەوەبو دایك دەبێ بۆ کوڕەکەی ژنی دوارۆژ بدوزێتەوه • ئەمه بۆ ئەم ژنه لادێیـــانه شـــتێکی ســـەیر و سەمەره نەبوو • ئەی گەنجێك چۆن دەتوانێ به جۆرێکیتری ژن بێنێ ؟ ئەو بەتەنیا ناتوانێ کچی خەڵك بناسێ • دەبێ ژنانی ماڵەکەی بیدۆزنەوه و بیناسن • ئەمه ئەوەشمان پیشان‌دەدا لێره پەیوەندی کوڕ لەگەڵ دایك و خوشکەکانی زۆر له هیی لای ئێمه بەهێزتر و پتەوتره • من جارێکیان چاوم به گەنجێ کەوت دایـــکه نەخۆشـــەکەی بەکۆلی خـــۆی هەلگرتبـــوو و هەلدەکشایه سەر گردێك بۆئەوه که بیبـــا بۆ نەخۆشخـــانه بچووکەکەی دووکان • ئەم دیمەنه ئەوەنده پڕ له خوشەویستیه ، ماوەیێکی درێژی دەوێ لەبیرم‌بچێتەوه •

## نیزامی پـــاتریارکی له کوردستان

خێزانەکان له کوردستان لەسەر نیزامی زنجـــیرەی بـــاوك و باپـــیر دەڕۆن ، ئەو نیزامه که لای باوك ، باپیر ، باپـــیری Patriarcy گەوره ••• هتد دەگرێ ، لای دایك فاگرێ کچی کێ بێ ببێ • که کـــوڕ ژنی‌هێنا ــ ئەو ژنه که دایکی بۆی دێنێ ــ له مـــالی باوکی دەمێنـــێ [1] •

---

(۱) ئەمه جاران وابوو ، ئێستا بەتایبەتی له شاران و لەناو خوێندەوارەکان وا نیه . زۆربەی کوڕەکان له شاران که ژنیان هێنا له مـــالی بـــاوکیان جیادەبنەوه و هێلانەیێك بۆ خۆیان دروست‌دەکەن . بێتـــو کوڕەکـــه

یەکبوونی کۆمەڵی (واتا ئیجتیماعی) باوك ــ دایك ــ منداڵ لێرە نیە . منداڵ و ساوا بچووکەکان هی دایکیانن ، بەڵام منداڵە گەورەکان دەچنە سەر باوکیان. کچێك جارێکیان گوتی : «زۆر خێزان داوایان کردووم». ئەمە لەباتی ئەوە بڵێ « زۆر کەس داوایان کردووم » [1] . ئەم کچە شووی نەکردبوو ، مامۆستا بوو و بە مووچەکەی دەیتوانی خۆی بەخێو کا . من لێم پرسی : «ئایا هیچ جارێ بیری لەوە نەکردوەتەوە لە ماڵی باوکی دەرچێ؟» ئەو پرسیارەکە تێنەگەیشت [2] و باسی ئەوەی بۆ کردم چۆن کۆمەکی باوکی دەکا لە شتی ناوماڵ ، کڕینی جل و پێڵاو بۆ خوشکەکانی ... ئەو بیری لە خۆی نەدەکردەوە ، بەڵکو بیری لە هەموو خێزانەکەی باوکی دەکردەوە. خۆشی و کامەرانی خێزانەکەی باوکی لای ئەو گرنگتر و بەهێزتر بوو لە ژیانی خۆی .

---

خانووی نەدۆزیەوە بۆ ماوەیێکی کورت لە ماڵی باوکی دەمێنێ ، لەپاشا جیادەبێتەوە .

**وەرگێڕ**

(١) بەکێك لەو نسانە ژنانی سولەیمانی دەیڵێن و هاوکاری ژنان پێکەوە پیشان‌دەدا ئەمەیە : کە بپرسی بۆچی فلان کچ شووی نەکردوە و ماوەتەوە ؟ لە وەڵامدا دەڵێن «خۆ داواکەری هەبوو » .

**وەرگێڕ**

(٢) لە کوردستان کچێك شووی نەکردبێ لەگەڵ باوکی دەمێنێ . باوکی نەبوو لەگەڵ برایێکی یان مامی دەژی . ژن لێرە بەتەنیا وەك لە ئەورووپا ناتوانێ و نابێ بژی ، مەگەر پیرێژن بێ . ئەویش بێتو خانووی هەبێ دەبێ لەگەڵ ژنێکی‌تری یان خزمێکی بژی . خانووی نەبوو ئەوا لە ماڵێك زووری بەکرێ دەگرێ و لەگەڵ ئەو خێزانە دەژی . بەڵێ لە رۆژئاوا ژنێك دەتوانێ بەتەنیا بژی و چی‌بەوێ بیکا ، بەڵام نەك لە کوردستان لە زوربەی وڵاتەکانی ئیسلام ئەمە مومکین نیە و ناشێ . لەو شارانە کە تێکەڵ روژئاوایی بوون وەك ئیستانبوول ، بێرووت ژنێك دەتوانێ بەتەنیا بە سەربەخۆیی بژی .

**وەرگێڕ**

لە ئەورووپا جۆرە خێزانێ پەیدا بوە و بوەتە بەشێك لە ژیاریـان و کۆمەڵ قەبوولی دەکا ئەویش دایکێکی بەتەنیایە ( بێوەژن یـان تەڵاقدراو ) لەگەڵ منداڵەکانی • دایکێکی تەڵاقدراو لە وڵاتانی موسوڵمان زۆر جار دەگەڕێتەوە ماڵی باوکی • بەڵام لە وڵاتانی موسوڵمان دایکی مـارە نەکراو لەگەڵ منداڵەکەی نیە • ئەم چەشنە دایکانە لە ئەورووپـا ئێستا قەبـووڵ دەکرێن ، بەڵام لەناو موسوڵمانان شتیوا نیە • لێرە کچ باش دەپارێزرێ و زوو بە شوو دەدرێ و کچێنی شتێکی زۆر گرنگ و ناسکە • کچێك پێش شووکردن کچێنی نەما لەوانەیە بکوژرێ •

لێرە ژنی تەڵاقدراو نیە لەگەڵ منداڵەکانی بەتەنیـا بژی [١] • ژنـی گەورەی شوونەکردو و پیاوی گەورەی بێژنیـش زۆر کەمـن • هـەر پیاوێ ئەوەندە پارەی هەبێ مارەییەکە بدا دەبێ ژن بێنێ • بێتو پـارەی نەبێ کەس و کاری دێنە کۆمەکی و ژنی بۆ دێنن • هەموو پیاوێ دەتوانێ هەتا چوار ژن بێنێ و تەڵاقیش ئاسانە ، لەبەرئەوە ژنان بەدەگمەن بێمێرد دەمێنن [٢] •

---

(١) بێتو ئەم ژنی تەڵاقدراوە منداڵی گەورە ، یان پارە و موڵکی هەبێ لەوانەیە بەتەنیا لە خانوویێك بژی •

**وەرگێڕ**

(٢) لە یەك ژن زیاتر هێنان ئێستا زۆرگرانە ، دەبێ لای قازی مارە بکرێ . قازیش نەزانێ پیاوەکە شەرتەکانی دینی جێبەجێ کردوە یان لەوانەیـە جێبەجێی بکا (واتا بتوانێ ماڵێکی جیاواز بۆ ژنی دووەم دامەزرێنێ و وەکو یەك تەماشای هەردوکیان بکا ) ژنی دووەم مـارە نـاکا . ئێستـا هەندێکەس بە دزیەوە لە لادێ ژنی دووەم دێنن . زۆر ژنهێنان ئێستا لە تورکیە و توونس بە یاسا (واتا قانوون) قەدەغەیە . لە عێراق و میسر شەرتی گرانی هەیە . لەپاشا تەڵاقیش ئێستا وەکو جاران ئاسان نیە . پیاو دەبێ لای قازی ژنەکەی تەڵاق دا .

**وەرگێڕ**

که باوك لەبەر هەر هۆیێ بێ ژنی دووەمی هێنا ، بۆ وێنە ژنی یەکەم مرد ، رۆیی یان جیابوەوە ، منداڵەکان هەموو پێکەوە دەژین • برا و زڕبرا، خوشك و زڕخوشك پێکەوە گەورە دەبن •

## ئیش و کاری ناوماڵ

ئیشی ناوماڵ ــ لە هەردوو خێزانەکە کە لەگەڵیان ژیام ، خێزانی سولەیمانی و هی تۆپزاوەی لای دووکان ــ زۆر بوو و لەبەر نەبوونی ئامێر ( واتە ئالەت ) و مەکینە زۆر کات و دەستی پێ دەویست • ماڵ وەك کارخانەیێکی بچووك وابو • لەوێ هەموو ژنان پێکەوە ناوماڵیان پاكدەکردەوە ، شتیان دەشۆری ، چێشتیان لێدەنا ، نانیان دەکرد ، مەشکەیان دەژەنی ، لە کانی ئاویان دەهێنا ، دروومان و پینە و پەڕۆیان دەکرد ••• و زۆر شتی‌تری • هەموو ئیش دەبوایێ بە دەس بکرێ • ئێمە لە ئەورووپا کە بۆ زۆر ئیش ئامێر بەکاردێنین ، لەبیرمان چوەتەوە کە ئیشی ناوماڵ لەوانەیە هەم خۆش بێ و هەمیش حەز بە کردنی بکەین • بەڵێ لە ئەورووپا ژنان حەز لە ئیشی کارخانە زیاتر دەکەن نەك لە ئیشی ناوماڵ • زۆر جار ئەمە لەبەرئەوەیە ژن لە کارخانە بەتەنیا نامێنێ و لەگەڵ چەند کەسێ پێکەوە ئیش دەکا و هاودەم و هاوکار دەدۆزێتەوە • بەڵام لە ئیشوکاری ناوماڵی کورد کە من دیتم و زانیم تۆ بیرای بیرای وەڕس نابی و بەتەنیا نامێنی و هەستی تەنیایی ناکەی •

## ژیانی سادەی لادێییەکان

کوردەکان ــ بەتایبەتی لە لادێ ــ ژیانێکی زۆر سادەیان هەیە • رۆژی دوو جار نانی سەرەکی دەخۆن • ئەم نان و خواردەمەنیە لەناو قاپ دەخرێنە سەر سینی بۆ چەند کەسێ ، سینیەکە لەکوێ ویستیان لە بەردەم خۆیان لەسەر زەوی دایدەنێن • نوێنیشیان زۆر سادەیە و بریتیە لە دۆشەك و

لێفه و سه‌رین که له‌سه‌ر به‌ڕه ، لباد یان فه‌رشێ له‌سه‌ر زه‌وی له یه‌کێ له ژووره‌کان یان له سه‌ریان راده‌خرێ . ئه‌مه ده‌بێته هۆی ئه‌وه ژماره‌یێکی زۆر مێوان قه‌بوول که‌ن و نان و نووستنیان بۆ جێبه‌جێ بکه‌ن . له‌به‌رئه‌وه مێوانداری‌یێکی بێ‌سنوور باوه و مێوانداری بوه‌ته نه‌ریتێکی زۆر به‌رز و به‌ڕێز . بێتو پایه‌ی کورده‌کان به‌رزتر بێ و له‌سه‌ر چوارپایه یان ته‌خت بنوون ، کورسی و قه‌نه‌په‌یان هه‌بێ ، له‌سه‌ر مێز نان بخۆن ، ئه‌ودمه مێوانداری خۆشی و تامه‌که‌ی جارانی نامێنێ و کز ده‌بێ .

## مێوانداری و باسی خه‌ڵك كردن

ئه‌م مێوانداری و کردنه‌وه‌ی ده‌رگایه بۆ هه‌ر خزمێ یان براده‌رێ ، له‌و ماڵه که ده‌ژیام بووبوه هۆی پته‌وکردنی په‌یوه‌ندی خێزانه‌که و ماڵه‌که له‌گه‌ڵ خه‌ڵك . له‌به‌رئه‌وه یه‌کێکی غه‌ریبی وه‌کو من که چاوی به خانویێکی بێ‌په‌نجه‌ره که‌وت واده‌زانێ خێزانی ئه‌و ماڵه ناتوانن په‌یوه‌ندی له‌گه‌ڵ خه‌ڵك په‌یداکه‌ن و ئاگایان له دنیا نیه . به‌ڵام راستیه‌که‌ی وا نیه ، له‌ودیوی هه‌ر دیواری ماڵێك ژیانێکی کۆمه‌ڵایه‌تی هه‌یه که هه‌مه چه‌شنه‌یه و پڕ به جووڵانه‌وه و بزووتن و گفتوگۆیه .

که‌یبانووی ماڵ هه‌موو ده‌مێ خه‌ریکی کاری خۆیه‌تی ، به‌ڵام هه‌ر ده‌قیقه‌یێك له‌وانه‌یه مێوانێك بێت و ئافره‌ته‌که ئیشه‌که‌ی راگرێ . ئه‌م مێوانانه له به‌یانی زووه‌وه دێن هه‌تا شه‌وێ دره‌نگ و به‌ده‌گمه‌ن ماڵ بێ‌مێوان ده‌مێنێ . له‌به‌رئه‌وه ژنانی ماڵ هه‌موو شتێ له‌لایه‌ن دراوسێکانه‌وه ، خزم و که‌س و کار و خه‌ڵکی‌تره‌وه ده‌زانن و ده‌یانه‌وێ هه‌موو شتێ — هه‌رچه‌ندی بچووك بێ — بیزانن . ئه‌مه ده‌بێته هۆی ده‌مه‌ته‌قێ ، غه‌یبه‌ت ، دووروویی و به چاك و خراپ باسی خه‌ڵك کردن . ئه‌م ژنانه له کۆبوونه‌وه‌کانیان له‌لایه‌ن ژیان و ئه‌حوالیان بڕیاری زۆر گرنگ ده‌ده‌ن .

مێرد سەرۆکی خێزانەکەیەتی کە لەسەر بناغەی زنجیرەی باوان Patriarch دامەزراوە • ئەو بڕیاری زۆر شت دەدا وەك ئیزن دانی ئەندامێکی خێزان بۆ سەفەرکردن • لەماڵەکەی سولەیمانیم جارێکیان کەیبانووی ماڵ لەگەڵ دوو کوڕ ، دوو زڕکچ و منداڵێکی ساوا بۆ چەند ڕۆژێ چوون بۆ دێیێك کە بە ئۆتۆمۆبیل زۆر دوور نەبو • بەڵام ئافرەتەکە لەو جێگایەوە چوە جێگایێکیتری و سەفەرەکەی بە ماوە و دووری درێژە پێدا • کە هاتەوە مێردەکەی لێی توورە بوو و بەتوندی لۆمەی کرد • بەڵام کە کچە گەورەکەی ڵاوێژی کرد و لەسەر باوەژنەکەی کردەوە ، کابرا نەرم بوو و لە توورەییەکەی هاتەخوارەوە •

پیاوان لێرە زۆربەی کاتی حەسانەوەیان بە دانیشتن لە چایخانە ، بە گەڕان لە شەقامەکان و لەناو باغی گشتی رادەبوێرن • لەوێ برادەرەکانی خۆیان دەدوزنەوە و قسەیان لەگەڵ دەکەن [١] • بەڵێ هەفتەیی ڕۆژێك باغی گشتی بۆ ژنان تەرخان کراوە ، بەڵام ئەمان ناچنە چایخانە • ئەرێ چایخانەیان بۆ چیە ؟ لە ماڵەوە لەگەڵ چەند ژنێ پێکەوە ڕادەبوێرن ، ئەوە لە چایخانە باشترە • یان دەچنە مێوانی بۆ ماڵێکی ناسیاو و ئەو ماڵە دەکەنە چایخانە • من هەندێجار بیر لەوە دەکەمەوە بۆچی ژیاری ئەورووپا دەستی خزمەت درێژناکا بۆ ژنانی کورد ، بەتایبەتی لەبابەت داو و دەرمان و تیمارکردنی پزیشکیەوە (واتا دکتوریەوە) بۆئەوە کە نەخوشی کەم بێ و ژمارەی مردنی ساوا بێتە خوارەوە [٢] •

---

(١) پیاوە زۆر دیندارەکان زۆر جار دەچنە مزگەوت ، لەوێ پێش یان پاش نوێژ لەگەڵ برادەرەکانیان دەمەتەقێ دەکەن .

**وەرگێر**

(٢) لە بیست ساڵی رابوردو ، داو و دەرمان و نەخۆشخانە لە کوردستان زۆر بووە . ئێستا ــ لە دێهاتە دوورەکان نەبێ ــ بەدەگمەن منداڵی ساوا

بەڵام من لەوە زیاتر دەبێ باسی لای چاکی ژیانی ئافرەتـانی کـورد بکەم کە لەکاتی مانەوەم لەناویان تێی گەیشتم • ئەم لایە باشانە ژیـانی ئەم ئافرەتانەیان خۆش و جوان و ڕەنگا و ڕەنگ کردوە ، ئەو ئافرەتانە کە لـە ژینەوارێکی (واتا موحیطێکی) وا دەژین کە لـە هەموو شـتێکی تـازە و دلخۆشکەرەوە بە هەموایی بێبەرە و بێبەشە • ئەمە لایـە چاکەکانیـان بەنرختر و نایابتر دەکا •

لەپاش گەڕانەوەم بۆ دێنمارك لە ئەندازیارێکی گەنجـەوە لەسـەر بەستێنی دووکان قاقەزێکم وەرگرت کە باسی ژیانی منی دەکرد لە تۆپزاوەوە دەیگوت : «لەبیرتانە ئێواراتنان چەند بە خۆشی و بێقرە و بڕە ڕادەبوارد ؟ سەماوەر جۆشەی دەهات و گفتوگۆ بە هێمنی و خۆشی دەوامی دەکرد • مرۆڤ هەندێجار قوول بیردەکاتەوە و تەئەممول دەکا ••• ئێوە کۆمەکیتان کردم ئەم ژیانە تێبگەم و حەزی لێبکەم • مـن هەندێجـار بـیر لـەوە دەکەمەوە ، ئایا دەتوانم ئەم جۆرە ژیانە لە ماڵی خۆم دروستکەم » •

ئەمە قسەکانی ئەو ئەندازیارە گەنجە ئینگلیزەیە کە لەسەر بەستێنی دووکان ناسیم و تێم دەگەیاند چۆن لەلای ئەوان لەگەڵ بوونی نـادی و حەوزی جوانی مەلەکردن وەڕس دەبووم ، بەڵام لە دێیە تەنهاکەم لەناو ژنـە کوردەکان بیرای بیرای عاجز و بێتاقەت نەدەبووم •

ئەم ئافرەتانە لـە کار و کردەوەیـان گوێیـان نەدەدایـە کـات و ماندویەتی • ئیشێك ـ بۆ وێنە ـ بە دە دەقیقە تەواو بکرێ ، ئەوان بـە

---

دەمرن . هەر خێزانێکی لادێیی ئێستا لە ٦ هەتا ١٢ منداڵی هەیـە . کۆڵانەکانی نزیك پڕن لە منداڵی هەراش لەبەر نەبوون یـان بچـووکی حەوشەی ماڵان .

وەرگـێر

سەعاتێك تەواویان دەكرد و بە ماندوویەتیەكی زۆرتـر ، لەسەرخـۆ بـە خۆشیەوە ئیشیان دەكرد • ئیش‌كردن الای ئەمان تەنیا فرمـاتێكی (واتـا وەزیفەییێكی) پێویست نیە وەك لای ئێمە لە ئەورووپا ، بەڵكو هەم فرمانە ، هەم یاریە و هەمیش بە خۆشی رابواردنە • لەبەرئەوە لە ئیش‌كردن ببڕای ببڕای وەڕس ، عاجز ، بێ‌تاقەت یان هیلاك نابن • كاتێكی زۆر و زەبەندەیان هەیە لەسەرخۆ بە خۆشی بەسەری‌دەبەن [1] •

ژنانی كورد توانای باشیان هەیە و زۆریان پسپۆڕن — بۆ وێنـە — لە دوورین ، چنین و شتی‌تری • بەڵام توانایی بە گورج و گۆلیان [2] نیە • ئیشەكانیان خۆشە و دڵی مرۆڤ دەكاتەوە ، ئەیانحەسێنێتەوە و رەحەتیـان دەكا • كە لەناو كۆمەڵی ئەورووپایی سەر بەستێنی دووكانەوە دەچوومـە تۆپزاوە هەستم بە رەحەتی و خۆشی دەكرد • لەوێ هەمووكەس لەسەرخۆ ئیش دەكا و درێژەی پێ‌دەدا • بەڵام لەناو ئەورووپاییەكان هەمووكەسێ بـە توند و تیژی ئیش دەكەن ، خۆیان ماندوو دەكەن و بە ماوەییێـكی كورت ئیشەكەیان تەواو دەكەن • بەڵام لەپاشا ماوەییێكی درێژی بەتاڵی بێ‌كارییان بۆ دەمێنێ كە نازانن چیی لێ بكەن و چۆن بەسەری ببەن •

ژنانی كورد كێشەی (واتا موشكیلەی) كات رابواردنیان نیە و وەك

---

(١) من جارێكیان لەناو جەباری نزیك ئاوی باسەرە لە رۆژهەڵاتی باشووری كەركووك لە ئاواییێك بووم. ئێوارە گوێم لە گۆرانی بوو بە دەنگێكی نزمی ژنانی . كە پرسیم ئەوە چیە گوتیـان ئـەوە فـلان ئافرەتـە بـە دەم دروست‌كردنی فەرشەوە بۆ خۆی گۆرانی دەچڕێ .

**وەرگـێڕ**

(٢) بەكوردی وشەیێك نیە بەرامبەر Efficiency ی ئینگلـیـزی مەبەست لـە Efficiency ئەوەیە كارێك بە كەمترین ماندویەتی و كورترین كات و بە باشی بكرێ . من بە كوردی «توانایی بە گـورج و گوڵی »م بۆ دۆزیەوە . Efficient واتا توانای گورج و گۆڵ .

**وەرگـێڕ**

ئێمە بیر لەوە ناکەنەوە چۆن کاتی خۆیان بەسەر ببەن • ئەوان کاتی خۆیان بە خۆشی رادەبویرن ، هەر ئیشێك بە دەستیانەوە بێ درێژەی پێدەدەن • هەموو دەمێ مێشك و دەمارەکانیان رەحەتە و حەساوەتەوە • چونکە فرمانەکانیان (واتا وەزیفەکانیان) بە خۆشی و لەسەرخۆ و بە بێ گرژبوونی دەمار و مێشك بەسەردەبەن ، ئەم گرژبوونە کە هەندێجار دەبێتە هۆی نەخۆشی ئەعصاب و خوێن وەك پەستۆی خوێن (واتا ضغط) و دڵ • ساوا و منداڵەکانیش ئەم ژیانەیان پێخۆشە •

که گەڕامەوە دێنمارك لێیان پرسیم : «ئەری خانم چۆن ئێواراتتان بەسەردەبرد و دەکوشت ؟ » لە وەڵامدا دەمگوت : ئێمە ئێوارانمان نەدەکوشت ، بە خۆشی ڕاماندەبوارد ، دەمە تەقێمان دەکرد ، بۆ ماوەیێك بێدەنگ دەماین ، مێوەمان دەخوارد ، چایمان دەخواردەوە و جغارەمان دەکێشا • ئێمە هەستی ئەوەمان دەکرد ژیان خۆشە ، لەبەرئەوە بەتام و لەزەت بەسەرمان دەبرد •

## - ١٣ -

# ماڵاوایی و دوعاخوازی

یەکەمین جار کە دەجلەم لە بەغدا دی عاسمان هەوراوی بوو • چەند دڵۆپێکی گەرمی گەورەی باران دەهاتە خوارەوە • ئەمە یەکەم و دواباران بوو لەو چوار مانگە لە عێراق مامەوە چاوم پێ کەوت •

یەکەمجار کە لە بەغدا مامەوە لە ماڵی خێزانێکی دینمارکی مێوان بووم ، ئەو ماڵە کە لە دەوروپشتی بەغدا و نزیک بەستێنەکەی ( واتا سەددەکەی ) تەنشت زێی دجلە بوو • هەموو ئێوارەیێ دەرگاوانێک دەرگای قەسرەکەی دادەخست •

جاری دووەم لە بەغدا لەگەڵ لیژنەی کۆنینەی دینمارکی دووکان Danish Dokan Expedition لە یەکێ لە ئوتێلە گەورەکانی بەغدا مامەوە ، ئەو ئوتێلە کە باغێکی گەورە و پانی هەبوو و دەگەیشتە سەر قەراغی دجلە • لە ژوورەکەم پانکە هەبوو لەگەڵ مەکینەی هەوا فینککەرە ئەم مەکینەیە هەوای فێنکی بۆ ژوورەکەم دەنارد ، بەڵام زۆر دەنگی لێوە دەهات نەیدەهێشت بنووم ، لەبەرئەوە ڕام گرت •

جاری سێیەم لە ئوتێلێك لە شەقامی ڕەشید دابەزیم • لەگەڵ تەرجومانەکەم و براکەی پێکەوە لە یەك ژوور بووین • لەم ئوتێلە ئەورووپاییتری نەبوو • هاوین بوو دنیا گەرم بوو خەڵك شەوان لە

سەربان دەنووستن • شەو برای تەرجومانەکەم چوە سەربان • ئێمە دوو ئافرەت لە ژوورەکە بەتەنیا ماینەوە • خێزانێکی هیندستانی لە ژوورەکەی تەنیشتمان بوو • شەوان دەرگایان دەکردەوە و هەندێکیان لە هەیوان لە بەردەم ژوورەکەیان دەنووستن •

لەورۆژە گەرمانە ئێواران دەچووینە سەر زێی دەجلە و لەوێ نانی ئێوارەمان دەخوارد • خۆشتر خۆراك كە تاقیمان کردەوە (مەسگووف) بوو کە بریتیە لە ماسی برژاو لەسەر دار و چیلکە لەگەڵ تەماتە و ئاڵەت و پیاز • چرای چێشتخانەکە کز بوو ، بەڵام شەوقی مانگەشەو پێمان‌دەگەیشت و دنیای رووناك دەکردەوە •

لە بەغداوە جارێك چوومە بابل ، لەوێ چاوم بە کۆنینەکان کەوت وەك شێری بەردین و دەرگای عەشتار •

لەپاشا لە عێراقەوە بە فرۆکە ( طیارە ) گەیشتمە ئیستامبوڵ ، لەوێ چوومە مۆزەخانەی (ئەیاسۆفیە) کە لەپێشدا لە زەمان بێزەنتیەکان کلێسە بوە ، لەپاشا تورکەکان کردیانە مزگەوت • ئەمە گومەزێکی گەورەی جوانی هەیە کە لە ژوورەوە بەناوی خەلیفەکان رازاوەتەوە • ئێستا ئەیاسۆفیە مۆزەخانەیە و بێجگە لە گەشتەوەر (سەییاح) کەسی تێناچێ •

لە ئیستامبوڵەوە چوومە ئەثینە Athens پایتەختی یۆنانستان• لەوێ ئەکرۆپۆلیس Acropolis بەرد و مەڕمەڕە م دی • بەرد و مەڕمەڕە رووتەکانی لەژێر عاسمانی شین سپی دەکردەوە • هەندێ لە مەڕمەڕەکان جوان رەنگ کرابوون • ئێوارە چوومە مۆسیقای کونسورت Orchestral Concert لە جێگایێك کە رۆمەکان دروستیان کردبو لە قەدی ئەکرۆپۆلیس • لەوێ گوێم لە مۆسیقای کلاسی گرت ، زۆر پێم خۆش بوو و باش حەسامەوە •

لە ئەثینەوە چوومە رۆما شاری کۆنی ئیتالیای ئیمرۆ • لەوێ چوومە Colosseum کە جێگای یاری‌کردنی رۆمەکانی کۆن بوە [1] •
ئەمە بریتیە لە دوونهۆم • نهۆمی سەرەوە سەکۆی هەیە بۆ دانیشتنی تەماشاکەران • ئەم سەکۆیانە وەك کەوانە لەلایێکەوە دەگاتە لایێکی‌تری و روو لە حەوشە خڕە گەورەکەی ناوەوە دەکا • نهۆمی ژێرەوە بریتیە لە دەرگا و ژوور بۆ حەپسەکان ، بەتایبەتی بۆ عیسەویەکان کە ئەو دەمە خرابوونە بەندی‌خانەوە •

لەپاشا چوومە مۆزەخانەی Villa Giulia • لە پشت ئەم مۆزەخانەیە پێپێلکانە هەبوو بۆ حەوشێکی بچووك لەژێر زەوی • لە حەوشەکە حەوزێکی ئاو هەبوو ، لە ناوەڕاستی لە نافورەیێکەوە ئاو بەرز دەبوەوە و دەڕژایە خوارەوە • لە هەردولای حەوزەکە گولی لۆتس Lotus ی سپی هەبوو بە گەلای سەوزەوە •

لەوێ لەبیرم چوەوە کە من هاتوومەتەوە ئەورووپا و لەسەر زەویە مەڕمەڕەکە لەتەنیشت نافوورەکە — وەك لە تۆپزاوە بم — بۆی دانیشتم بۆ ئەوە کە خۆشی و فێنکی ئاوەکە بە ڕەحەتی بچێژم • لەوێ لە کاتێکی بێ‌دەنگی لەسەر زەویە مەڕمەڕە پاکەکە گوێم لە چۆڕەچۆڕی نافوورەکە بوو • بەدانیشتن ئەژنۆم بەرزکردبوەوە و هەردو دەستەکانم خستبوە سەر ئەژنۆکانم و قوول بیرم دەکردەوە لە کوردستان و کچ و ژنە باشەکانی • لەوێوە ، لەو دوورەوە ماڵئاوایی و دوعاخوازیم لێ‌کردن •

(1) وەك جێگای تەماشاکەرانی توپێنە ، کە لەسەر سەکۆکان . دادەنیشن و تەماشای یاریەکە دەکەن .

# پێڕست

من مطبوعات المجمع العلمي العراقي
( الهيئة الكردية )

# بنات الكرد

تأليف

**هيني هارولد هنسن**

ترجمة

**الدكتور ناجي عباس احمد**

من الانكليزية

مطبعة المجمع العلمي العراقي
بغداد ـ ١٩٨٠